الله نور السموات والارض



# چرای رووناکی

٢٦

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیری - ئایینی - کۆمەلایەتی - گشتی یە

- مساعد ((بابا الفاتيكان))



- بێرێزی کردن بەرامبەر قورئان خزمەت بە ئاشتی و پێکەوە ژیان ناکات



- ئافرەتی رووت و ئەو نەخۆشییە ترسناکەی دووچاری دەبێت

- بروسکەی سوتێنەر بۆ سەر دوو شوبهەی سەردەم!!

- مسعود عبدالخالق:
روونکردنەوەیەک لەبارەی هاتنی هاوەڵان بۆ کوردستان



ماموستا ملا محمودی بەڵخە

# (٢١) ی سێبتەمبەر، ڕۆژی ئاشتی جیهانی

سـەدی ٢٠ و ٢١ بەسـەدەی پێشـکەوتنی تەکنـەلۆژیای سـەردەم دادەنرێت لەم سەدەیەدا مرۆڤ لەهەموو بوارەکانی ژیان پێشکەوتنێکی زۆر بەرچاوی بەخۆوە دیوە، لەنێو ئـەم پێشـکەوتننانە پەیدابونی چەکی ئەتۆمی و بایۆلۆژی و سوتێنەرە، کە هەڕەشە لەسەر ژیانی سەرجەم مرۆڤایەتی دەکات، هەموو وڵاتان هەوڵی دروستکردنی جۆرەها چەکی بەهێز دەدەن بۆ خۆ سەپاندن بەسەر وڵاتانی تر لەژێر درووشمی "تۆ دەکوژم تامن بژیم"، بەناوی سەلام چەکی ئەتۆمی دروست دەکرێت، هیچ چینێك بەئەندازەی مرۆڤ لە هەرەشەدانی یە!!! لەگەڵ ئەوەش جارجارە لەجیهانی هەرەشە و تۆقاندن خەڵکانێك هەن هەست بەوە دەکەن کەمرۆڤ لەم جیهانەدا لەژێر هەرەشەدایە، بیر لە ئاشتی و ئارامی و بەختەوەری دەکەنەوە بۆ مرۆڤ دوای ئەوەی زانرا مرۆڤ زۆر لەژێر هەرەشەدایە ڕۆژێکیان داناوە بەناوی (ڕۆژی ئاشتی جیهانی) ئەم ڕۆژە ئەگەر ناوەرۆکەکەی وەك باقی ڕۆژەدیاریکراوەکانی ترە، بەڵام ئێمە وەك موسڵمان پشت گیری لەم ڕۆژە دەکەین کە لەگەڵ ئامانجە سەرەکی یەکانی ئیسلامدا گونجاوە، ناوێك لەناوەجوانەکانی خودا (السلام)ە (هوالله الذی لااله الا هوالملك القدوس السلام).

_ پێغەمبەری خودا وەسف کراوە بە ڕەحمەت کە ئاشتی بەشێکە لە ڕەحم (وما ارسلناك الا رحمة للعالمین)

_ ئەو شەوەی کە قورئان دابەزی تابەیانی مەلائیکەتەکان سەلامیان باراند وەك دەفەرموێت {تنزل الملائكة والروح فیها * باذن ربهم من كل امرٍ * سلام هي حتى مطلع الفجر}.

_ یەکەم وشەی بەیەك گەیشتنی موسڵمان (السلام علیکم)ە.

_ دەرگایەك لە ماڵی خودا کە (کەعبەیە) بەناوی (باب السلام)ە.

_ دەرگایەك لە مزگەوتی پێغەمبەر (ص) بەناوی (باب السلام)ە.

_ زیاتر بە (١٣٣) ئایەت لە قورئاندا باسی سەلام و ئاشتی یە.

_ ناوی بەهەشت (دار السلام)ە {لهم دار السلام عند ربهم}.

مەلائیکەتەکان پێشوازی لە ئیمانداران دەکەن لە بەهەشت بە سەلام {وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ * سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ} الرعد٢٣_٢٤. سەلام لەهەر شوێنێك بێت هیواو ئاوات و ئامانجی موسڵمانە.

_ گوشتارگەی موسڵمانان لە سایەی ئاشتی جیهانی لەم سەدەی ئاشتی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی و ئازادی لە ماوەی نیو سەدە دا بە ملیۆنەها موسڵمان کوژراوە، بە درێژایی مێژوو بە ئەندازەی ئەم سەدەیە موسڵمان نەکوژراوە.

١_ لە ساڵی ١٩٧١ لە گوشتارگەی بەنگلادیش دوای بەسەرکەوتنی سوپای هیندی زیاتر لە ١٠٠٠٠ زانای موسڵمان و ١٠٠هەزار قوتابی زانکۆ و پەیمانگا و کارمەندی وڵات کوژران.

٢_ یوغسلافیای پێشو لە گوشتارگەی بوسنە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم یەك ملیۆن موسڵمانی کوشت.

٣_ لە ساڵی ١٩٥٤ لە (صین) زیاتر لە ٣٦٠٠٠٠ هەزار موسڵمان لە شاری (کاشغر) کوژران.

٤_ گوشتارگەی موسڵمانان بە دەستی طاغوتی گەورەی سەردەم (هیلا سیلاسی) پیلانێکی ١٥ ساڵی دانا بۆ لەناوبردنی موسڵمانان، شانازی پێکرد بەرامبەر کونگرێسی ئەمریکی، هەستا بە سوتاندنی پیر و ئافرەت و منداڵ بە ئاگر و بەنزین لە شاری (جرسیم) وەفەرمانی کرد بە نەزۆك کردنی پیاو و ئافرەتی موسڵمان. لەدوای ئەو خوێنڕێژی (منجستو) هەستا بە بەرپاکردنی گوشتارگەیەکی گەورە لە شاری (ریرادار) لە هەرێمی (اوجاوین) زیاتر لە ١٠٠٠ موسڵمانی کوشت.

٥_ گوشتارگەی موسڵمانان لە فلیپین لە سەر دەستی حکومەتی (مارکوس) بە زیندویەتی چەندان موسڵمانی سوتاند و سەری بڕین ٣٠هەزار موسڵمانی کوشت و ١٠٠دێهاتی تێك داو ٣٠٠هەزار ماڵی سوتاند.

٦_ گوشتارگەی موسڵمانان لە هیند لە ساڵی ١٩٧٠ بە وتەی (ئەندیرا غاندی) ١٥هەزار موسڵمانی کوشت لەناو ئەوانە ٣٠٠ ئافرەتی سوتاند.

٧_ حکومەتی بوذی لە (تایلەند) هەستا بە کوشتن و بڕینی موسڵمانان و زیاتر لە ١٠٠ گەنجی بە بەنزین سوتاند و گوتی خوێنی موسڵمان بەرامبەر نرخی گوللەیەك نیە.

٨_ گوشتارگەی موسڵمانان لە کشمیر ٤٤هەزار کەس کوژران و ٦٧هەزار کەس بریندار کران ٤٠هەزار کەسیش دەزگیرکران و ١٢٩هەزار خانو و ماڵ و مزگەوت تێك درا بێجگە لە دەستدرێژی بۆسەر ئافرەتان.

٩_ کوشتارگە و مەئساتی موسڵمانانی بۆسنە و هیرسك کە جیهانی هەژاند، بە دەیان هەزار موسڵمان کوژران و سەر بڕدران دەستدرێژیان کردە سەر ١٠٠ئافرەت و هەزار منداڵیان لە (سرایف) سوتاند، ٢ملیۆن و نیو دەرەبەدەر بوون.

هەر لە ساڵی (١٩٩٥) ٢٠هەزار کەسیان لە شاری (سریبرینتس) کوشت کە ئەم شەڕە لە ژێر چاودێر (حمایە)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو.

١٠_ ١٨٢هەزار کوردی موسڵمان لەگەڵ ٨هەزار بارزانی و کیمیابارانکردنی ٥هەزار کەس لە هەڵەبجە، لە ژێر سێبەری ڕۆژی ئاشتی جیهانی بەم شێوازە بە هەڵس و کەوتی جیهانی ئەمڕۆ لەگەڵ موسڵمانان دەبێ موسڵمانان ئاگاداری ژیاننامە و کارەساتی براکانی بێت لە جیهان.

وەهەروەها لەگەڵ کوشتارگەکانی (ڕوسیا، بۆرما، لیبریا، سریلانکا، ئازربایجان، کوسۆفو، شیشان، ئسرایل و ئەفغان)...

ژماره ٢٦

شوال - ذوالقعدة ( ١٤٣١ ) كۆچی

رەزبەر ( ٢٧١٠ ) کوردی

تشرینی یەکەم ( ٢٠١٠ ) زایینی




◄ خاوەن ئیمتیاز:
د.ئەحمەد محمد بالیسانی
٠٧٥٠٤٨١٣٢٦٩

◄ سەرنووسەر:
م.ئیدریس کەریم کاریتانی
٠٧٥٠٤٨٦٢٧٣٦

◄ بەڕێوەبەری نوسین:
م.شێرزاد عبدالوهاب

◄ ستافی وەڵام دانەوەی پرسیاری شەرعی:
(م.مەلا محمد سلمان پاك) فەخری
شێخ عبدالرحمان بەرزنجی
شێخ ئەحمەد بالیسانی

◄ ستافی نووسین:
م.اسماعیل ئەجمدین-م.زرار محمد صادق-
م.نادر رشید-د. یحیا مولود-
م.عبدالخالق محمد-م.نیزامەدین یونس-
م.خیرالله ملا حسن کاسکەیی

◄ هەڵـەچـن:
هاوکار عبدالله شێخ وەسانی

◄ دیـزایـن:
هێـرش حمـد

## لەم ژمارەیەدا



ناونیشان، هەولێر/ ١٠٠ مەتری - گەرەکی هەڤالان - شەقامی بەنزینخانەی گوڵ

ناریافۆن: ٠٦٦٢٥٥٩٧٨٥ کۆرەك: ٠٧٥٠٧٠٤٢٢٦١ ئاسیا: ٠٧٧٠٤٣٠٤٠٧٠

chrairunaki@yahoo.com Www.chrairunaki.com

# بێڕێزی کردن بەرامبەر بە قورئان خزمەت بە ئاشتی و پێکەوە ژیان ناکات

## هاوڵاتییەك: "ئامادەم بە خوێنی خۆم بەرگری لە قورئان بکەم"

ڕاپۆرتی نەوزاد کەلهور

هاوڵاتیەکی مەسیحی ( قەشە ئیما جونز نوێنەرایەتی دنیای مەسیحی ناکات, وبریارەکەشی گوزارشت لە بۆچونی خۆی دەکات)

قورئان یەکێکە لە کتێبە پیرۆزەکانی ئاسمانی, ئەمڕۆ بە ملیارەها کەس بروای بەو قورئانە هەیە, و بە چاوێکی پیرۆزەوە تەماشای دەکەن, کەواتە بێڕێزی کردن بە قورئان واتە بێڕێزی کردن بەرامبەر بە پیرۆزیەکانی ملیارەها کەس و بۆیە لەناو موسڵمانانادا هەیە خۆی بکاتە قوربانی قورئان, هەر بریارێکیش لە لایەن هەر کەسێك دەردەچێت ئەو بریارە گوزارشت لە بۆچونەکانی خۆی دەکات, کەسیش ڕێگای بە هیچ کەسێك نەداوە خۆی بکاتە نوێنەری خەڵك, لە هەمانکاتیشدا دەرچونی بریاری لەو شێوە خزمەت بە هیچ کەسێك ناکات و بە دووریش نازانرێت ئاسایشی نەتەوەیەك بکەوێتە مەترسیەوە یاخود هیچ نەبێت ئەو جۆرە بریارانە کاریگەری نەگەتیڤانەی هەبێت لەسەر ئابوری وڵاتێك.

(ئیدریس جەوهەر ) تەمەن ٤٠ ساڵ و دەرچووی کولیژی زانست گوتی ئەگەر چی ئەو بریارەی کە لە لایەن قەشە جونزەوە دەرچوە گوزارشت لە بۆ چوونی خۆی دەکات, بەڵام لەگەل ئەوەشدا کەسانێك هەنە لە جیهانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات, دیارە مەبەست لە دنیای مەسیحی و ئیسلامیە حەز بەوە دەکەن ئەو بریارە جێبەجێ بکرایە, ئەو هاوڵاتیە هۆکارەکەی بۆ ئەوە گەراندەوە کە چاویان بە ئیسلام هەلنایەت, ئەو ئاینە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زۆر بوندایە بە قسەی ئیدریس لە پاش کارەساتەکەی یازدەی ئەیلول زیاتر لە میلیونێك کەس زیاتر لە ڕۆژئاوا بونەتە ئیسلام ئەوە وای کردووە پەچە کرداری کەسانی سەرسەخت بە هێز بێت, ئیدریس پێی وابو ئەو پەچە کردارە بە قازانجی بەرامبەر تەواو دەبێت. هاوڵاتی مەسیحی ( نەجیب یەلدا)گوتی من بەشبەحالی خۆم لەگەل ئەوەدا نیمە سوکایەتی بە پیرۆزیەکانی هیچ کەسێك لایەنێك و ئاین و نەتەوەیەك بکرێت, قورئانیش کتێبێکی ئاسمانیە وەکو ئینجیل, ئەو هاوڵاتیە لای وابو دەبێت ڕێز لە پیرۆزیەکان بگیرێت, پاشان دەربارەی بریاری ئەو قەشەیە گوتی دیارە **قەشە ( جونز ) نوێنەری دنیای مەسیحی نیە و بریارەکەشی کەسیەو گوزارشت لە بیرو بۆچوونی خۆی دەکات**, پاشان ( نەجیب ) گوتی ئێمە دەمێکە

لەگەل موسلمانان دەژین شتە پیرۆزەکانی ئێمە لای ئەوان ڕێزی لێگیراوە هەروەها لە ڕۆژئاواش موسلمانان بە ئازادی ئەرکە ئاینیەکانی خۆیان لەمزگەوتەکان جێبەجێ دەکەن بێئەوەی کەس سوکایەتیان پێبکات .

(مریەم ئەحمەد )تەمەن ٧٠سال گوتی لەو ڕۆژەوە ئەو هەوالەم بیستوە گەلێك دلتەنگم پاش هەموو فەرزی نوێژەکان دەست بەرز دەکەمەوەو دوعا دەکەم کە خوای گەورە دەستیان نەدات ئەو کارە بکەن, چونکە وەکو مریەم خان پێی گوتین هیچ شتێك لە قورئان گەورەتر نیە و قسەی خوایە بە دیاری بۆ پێغەمبەر (د.خ) بە خەلات هاتوە ئەو ئافرەتە دلنیا بوو لەوەی هەر کەسێك بێرێزی بەو قورئانە بکات خوای گەورە لێی قبول ناکات.

(خەیام فاروق )تەمەن ٢٣ سال و دەرچوی بەشی سیاسە گوتی من پێم وایە ئەو کارە ڕەنگدانەوەیەکی خراپی دەبێت لەسەر جیهانی ڕۆژ ئاوا بە تایبەتی ئەمریکا چونکە ئەو قەشەیە لە ئەمریکا نیشتەجێیە و پاشان خەیام ئەوەشی بە دوور نەزانی کە جێبەجێ کردنی ئەو بریارە زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا دەگەیەنێت کاردانەوەو پەچەکرداری بە هێزی دەبێت لە لایەن موسلمانەکانی ئەو ولاتە بە تایبەتی و موسلمانان بە گشتی پاشان خەیام لە درێژەی قسەکانیدا ئەوەشی بە دوور نەزانی ئەو بریارە ئەگەر چوبایە بواری جێبە جێ کردنەوە چاوەروانی توندو تیژی لێ دەکرا, دواجار ناوبراو ئەو بریارەی بە گەوجانە وەسف کردو پاشگەز بونەوەشی بە ئاقلانە لێکدایەوە, دواجار خەیام لە وەلامی دەرکردنی بریارەکەو پاشگەزبونەوەی گوتی ئەو بریارە ئەو کاتە درا کاتێك سەرۆکی ئەمریکا بریاری دروست کردنی سەنتەرێکی ئیسلامی دا لە نزیك بالەخانە رووخاوەکەی سەنتەری بازرگانی ئەمریکا بۆیە بە دووری نازانم کەف و کولێکی کاتی بوبێت, پاشان خاوەنی بریار بەخۆیدا چۆتەوەو پاشگەز بۆتەوە.

(موزەفەر سدیق) تەمەن ٣٥ سال و دردەرچووی کولیژی ئابوری گوتی دەرچوونی ئەو بریارە لە جێگای خۆیدا نەبوو و بەلام لە جیهانی ڕۆژئاوا شتێك هەیە بەناوی ئازادی را دەربرین, ئەو کەسەی کە بریارەکەی دەرکردوە ئازادی را دەربرین وپێشێلکردنی ماف و ئازادیەکانی خەلکی تێکەلاو کردووە, هەر بە ڕای ئەو ئابوری ناسە ئەوە ئازادی نیە کە هەست و سۆزی ملیونەها کەس برینداربکرێت, قورئان کتێبێکی پیرۆز بە لای ئێمەی موسلمان جا سوتاندنی ئەو کتێبە خزمەت بە کێ دەکات ! پاشان موزەفەر گوتی هیچ بە دووری نازانم ئەگەر ئەو بریارە چوبایە بواری جێبە جێ زیانی بە ئابوری ئەمریکا دەگەیاند هەروەکو دیمان چەند سالێك بەر لە ئەمرۆ ولاتانی ئیسلامی پەیوەندی بازرگانیان لەگەل ولاتی (دانیمارك ) پچراند بە هۆی ئەوەی بێرێزی بەرامبەر بە پێغەمبەر (د.خ)کرابوو .

ماموستا (جلیل ) دەرچوی کولیژی شەریعە گوتی ئاینی ئیسلام ئاینی ئاشتی و بە یەکەوە ژیانە وەکو دەبینین چەندەها کەس لە ئاینی مەسیحی و جولەکە لە ولاتانی ئیسلامی دەژین بێئەوەی کەسێك سوکایەتی بە بە ها پیرۆزیەکانیان بکات , قورئانیش کتێبی پیرۆزی ئیسلامەو دەبێت رێز لەو پیرۆزیە بگیرێت , ئەو ماموستایە گوتی ئەگەر تەماشای قورئان بکەین گەلێك ئایەت بە گەورەیی و بە رێزەوە باس لە حەزرەتی عیسا دەکات کە پێغەمبەری مەسیحیەکانە جا ئەو قەشەیە ئەگەر هەندێك شارەزایی لە قورئان هەبوایە ئەو بریارەی نەدەدا.

# پرۆژەی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز وەك پیشەو كارو كاسبي لەپرسەكاندا ,لەنێوان ( نان بڕین ) و (گیرفانبڕین) دا!

م. نیشتمان گەردی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قالــــه تعـــالى{ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا}

بێگومان هەر بیرۆکەیەکی جوان, یان هەرکارێکی بەجێ یا هەرپرۆژەیـەکی سود بەخش لەپێناوی خزمـەتکردنی کۆمـەڵگادابێت, پێویسـتە بەهـەموو لایـەکمان کـاری بۆبکـەین و گرینگـی پێبــــدەین بەتایبــــەتی لایــــەنی پەیوەندیدار بە پرۆژەکە پێویستە بە ئەرکی خۆی بزانی بیخاتە بواری جێ بـەجێ کـردن نـەك تــەنها دەسـت خۆشـی لێکـردن جونکــە دەســت خۆشـی تــەنها قســەیە وقســەش ناچێتە ناو گیرفانەوە ئەوەی لێـرەدا سەرنجی راكێشام و هانیدام كـە ئـەو چـەند دێـرەی بۆبنوسـم ئـەو پـرۆژە جوانە بوو كە لەلایان بەرێز مـەریوان نەقشەبندی بەرێوەبەری ڕاگەیانـدنی وەزارەتـی ئاوقـاف پـێش كـەش بـە وەزیـری ئاوقـاف و كاروبـاری ئـاینی كـــرد, دەربـــارەی ئـــەو قورئـــان خوێنانەی كـە بـە پـارە لەپرسـەكان قورئـــان دەخـــوێنن و رێگـــرتن و قەدەغـەكردنی ئـەو جـۆرە كاسـبیە بـــەهۆی كاســـیەتی (ســـیدی ) و بڵندگۆوە قەرەبووی ئـەوكارە بكـرێ بەمەبەسـتی بەرژەوەنــدی گشــتی بێگومان كاتێ دەنگۆی ئەو پرۆژەیـە بڵاوبۆوە , یەكسەر قورئان خوێنـانی شـاری سلێمانی هاتنەسەرشـەقام و نارەزایان دەربڕی و گوتیـان بۆچـی ئێمە توشی نان بڕین دەكەن ؟

بەراستی زۆرم بەلاوە سەیر بوو كەوا كەمینەیەك زۆرینەیـەك بچەوسێنەوە و لەســـەر حیســابی خـــەڵكی جگـــەر سوتاو و دایكە هەتیوو لێقـەوماوان , بازرگانی بە وتەكانی خوای گـەورە و قورئانی پیرۆز بكەن بەبێ گوێ دانە حـــەرام و حـــەلاڵ و زۆرینەیـــەكیش لەبەر شەرمی ڕووان و چـاولێكەری و داب و نەریتی نـا دروسـت و قسـەو و قسـەلۆك توشـی زیـان لێكـەو تـنی ماددە و مەعنەوی بـن لـە یـەك كـات دا! لێرەدا كـە باسـی ( نـان بـڕینی) قورئـان خوێنـان دەكـرێ مـن دەڵـێم مـــادەم ئـــەم خۆپیشـــانە بـــە ڕەوا دادەندرێت باسبەینێ ئەگـەر كاسـبی فالچـی و جـادوو گـەران قەدەغـەكرا بائەوانیش بێنە سەر شەقام و باسـی ( نان بڕین ) بكەن ! ! !

پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێت (إقرءا القران فأنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه) واتە قورئان بخوێنن تـاكو لە ڕۆژی دوایی شەفاعەتان بۆبكات , باشــە خۆنــەی فــەرمووە قورئـــان

بخوێنن تاکو له دونیا پێی دەوڵەمەندبن !

ئەوەی شایانی باس بێت ئەگەر ئێمە خۆمان بە موسڵمانی ڕاستە قینە بزانین و کاری ناسیاوماتن لە نێو کۆمەڵگا دا بینی دەبێ خۆمانی لێ بێدەنگ نەکەین و هەوڵی گۆڕینی بۆبدەین بەتایبەتی لایانی پەیوەندی دار وەك و وەزارەتی ئاوقاف و یەکێتی زانایانی ئاینی و لێژنەی ئاینی لە پەرلەمانی کوردستان دا , هەروەکو پێغەمبەرمان (د.خ ) دەفەرموێت (من رأى منكم منكراً فليغيره) یاخود (الساكت عن الحق شيطان أخرص) ! زۆر بەداخەوە هەندێ لە مامۆستایانی ئاینی کە لە ڕاگەیاندنەکان دا پرسیاری ئەوەیان لێدەکرێ ئایا کاسبی کردن بە قورئانی پیرۆز حەرامە یان نە ؟

لەوڵامیکی شەرمنانەدا مامۆستایەکە بە پێکەنینێکی لەسەرخۆوە دەڵێ دەترسم ڕاستیەکەی بڵێم نەوەك قورئان خوێنان لێم تورەبن! باشە مامۆستای بەڕێز تۆخوای گەورە لە خوێت تورەبکەی باشترە یان بەندە؟؟ ئەی مادەم بۆچی خوای گەورە دەفەرموێ ( فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) ئەوەی ڕاستی بێت هەموو لاپەرەکانی قورئانی پیرۆزم خوێندۆتەوە لەهیچ دێڕێك باسی ئەوە نەکراوە کەقورئانی پیرۆز بۆ بازرگانی و کاسبی هاتبێتە خوارەوە و



گیرفان بڕینی خەڵکی جەرگ سوتاو و ماڵە هەتیوو هەژار و داماوی پێبکرێ بەونیازەی کە خەڵکی سادەو نەخوێندەواری پێ چەواشە بکرێت ( استغلال ) بکرێت کە گوایە خێر بۆ مردووەکە بنووسرێ و بەو مولود و دەف لێداتە یەکسەر بچێتە بەهەشت .

حەز دەکەم ئەوەش بڵێم کە قورئان خوێندن بۆ زیندووانە نەك بۆ مردوان لە پرسەکاندا , تاکو زیندووەکان وانەو ئامۆژکاری و بەرنامەی ژیانی ڕۆژانەیان پێ فێربین و ببێتە گرتنەبەری ڕێگای ڕاستی و دوورکەوتنەوە لە خراپە و ببێتە تێشووی دواڕۆژمان ....

بەڵام کەسی مردوو کە دونیای خانی بەجێ دەهێلێ دەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە یەکسەر کارو کردەوەی دەف تەری ژیانی دادەخرێت , تەنها ئەوەندەنەبێت کە پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێ (إذا مات إبن ادم أنقطع عمله إلا عن ثلاث، صدقة جارية، أو علمٌ ينتفع بهِ أو ولد صالح يدعُ له) واتە ئەگەر کەسێك مرد کردەوەکانی لە دونیا دەپێچرێت تەنها ٣ شت لەدوای بەجێ دەمێنێ ئەویش خێرێك کەوا خەڵکی تریش لە دوای خۆی سودی لێببین بۆنمونە دورست کردنی مزگەوت یان

قوتابخانــه یــان نەخۆشــخانە یـا هەرشتێك سودی خـەڵکی تـری هـەبێ هەروەها زانیاریـە کـە لـەدوای خـۆی سوودبەخشـێ وەك لەچـاپ دانـی پەرتوکێکی سودبەخش یان منداڵکی بـاش کـە دوعـای خێـری بۆبکـا... وەلەباسـی خوێندنـەوەی قورئـانی پـــیرۆزدا پێغەمبـــەر ( د.خ) دەفەرموێت (خیرکم من تعلم القران وعلمه) چاکترین کەس ئـەو کەسـەیە کـەفێری قورئـان خوێندنـەوەبێت و خـەڵکی تـریش فێربکـات باشـە خـۆ نەیفـەرمووە قورئـان خوێندنـەوەبن تـاوەکو بیکەنـە پیشـەوکارو بـۆ ( استغلال) کردنـی خـەڵکی سـادەو و ساویلکە و بۆ گیرفان برینی خاووەن مردووەکان و بەرزکردنـەوەی کۆشك و تەلاری خۆیان !

راستە مـردن بـرا گەورەیـە و حەقـە دەبێتـە میـوانی هـەموومان بـەلام بەنۆرەیە و دەبێ هەمووما‌ن تـامردن بچـێژین و لـەلایان کـەس و کارمـان پرسەمان بۆ دابندرێ بەلام نـەك ئـەو مردنە ببێتە مایـەی ئـەوەی زەرەر و زیـانێکی زۆری ئـابووری لـە پێنـاو بەرزکردنـــەوەی کۆشـــك تـــەلاری لێخورینی مۆنیکای ئاخیر مۆدێل بـۆ قورئان خوێنان !

**خستنە رووی چەند دیاردەیەکی زۆر نامۆ لەلایەن قورئان خوێنە ئافرەتەکانەوە...**

ئەوەی جێگای سەرنج وباس کردنـە لەدوای راپەڕین دا بەهۆی ئابلووقەی ئابوورییـــەوە توشـــی زیـــانێکی زۆر سەخت و گرانیەکی زۆر گەورە هـاتن و کـــارو کاســـبیش زۆر کـــەم بـــوو بـەجۆرێك زۆربـەی خـەڵك نـاو مـاڵی خۆیان فرۆشت بۆ پیدا کردنی نـان و قـووتی رۆژانـەیان ، وە هـەر لـەکاتی گرانـــی و ئابلوقـــەی ئابووریـــدا بەشـــێوەیەکی زۆر لەئافرەتانـــدا بیریان لەوە کردەوە کە بەهەر شێوە کاسبی و پـارە پەیـدا کردنێك بێت هەتا ئەگەر کاسبەیەکەش ناشـەرعی بـێ برێـك پـارە پەیـدا بکـەن و رووبـەڕووی ئـەو گرانـی و قـات و قوڕییـە بێتـەوە ، بـەڵێ هەنـدێکیان بـوون بەفاڵچـی و قـاوە گـرەوەو بەشـــێکی زۆریشـــیان نیمچـــە خوێندەوارییـەکیان هـەبوو، بـوون بـەقورئان خـوێنی پرسـە و بۆنـەکان وە هەنـدیك لـەو قورئـان خوێنانـەش مامۆستای قوتابخانە بوون و بـەهۆی کەمی مووچەکەیان ڕوویان لەم کارە کـردو بـۆ یەکـەم جـار سەرپۆشـیان کردە سەرو ناویان لەخۆیان نا (مـەلا .. فلان) لەپاشان بەهۆی ئەو دەست کەوتــە زۆرەی کــە لەپرســەکاندا دەســـتیان کـــەوت و ناوبانگیـــان دەرکردو خەڵکیان ناسی و خـەڵکیان چەواشـــەو دەســـتەمۆ کـــردو کاســـبەیەکەیان ســـەری گـــرت و پارەیـەکی باشـیان دەسـت کـەوت ،

ئەو جارەیان زیاتر (تەماح) کاری تێ کـــردن و هەنـــدێکیان لەماڵەکـــەی خۆیـــان (تەکیـــە) یـــان کـــردەوە و بەپارە ئـافرەتی بـەناو تـۆ بـەکاریان هێنایە ناو تەکیەو مریدو دەروێشیان پەیـــدا کـــرد ، ئێســـتاش بـــەهۆی ناوبانگیان زیاتر بەرەو سەرمایەداری چـوون و بـەهۆی نزیـك بوونـەوە و دەســـــــتەمۆکردنی خێزانـــــــی بەرپرســەکان پارچــە زەوی (٤٠٠) مــەترییان لەحکومــەتی کابینــەی پێنجــەم وەرگرتــووەو کردوویانــە بەتەکیەو بازاریان گەرمتر بووە ...

لێـرەدا دەمـەوێ چـەند ڕاسـتیەك بەبەڵگـەوە بخەمـەڕوو دەربـارەی هەنـدێ لـەقورئان خوێنـانی ئـافرەت لەپرسەکاندا کەچ جۆرە بازرکانیـەك دەکەن و چ جۆرە گیرفـان دڕانـدنێك دەکـەن بـەناوی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلامەوە ، کە ئەم جۆرە کاسبیە زۆر دوورە لەرەوشـــــت و بـــــەها بـەرزەکانی ئـاینی ئیسـلام ئـەوەش یـەکێك لـەو ئافرەتـە قورئـان خوێنـە بەناوبانگەکانی شاری هەولێر کە لەو دواییەدا سەرپۆشی لەسەر کردووەو بـەهۆی ئـەو کاسـبیەوە مۆنیکا لـێ دەخـورێ و هـەموو سـاڵێك بـەنیازی بازرگـانی دەچـێتە حـەج وعـومرەو دەبێتــە (حەملــەدار)ی ئافرەتــان و چەند هەزار (تسبێحێکی) مـوورووی شین لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە گوایە کردوویەتی بە(موتفەڕك) و ئەوەی چ

نیازو خۆزگەو ئاواتێکی لەدڵدایە گوایە بەو تەسبێحە شینە بۆی جێ بەجێ دەبێ , ئینجا لەناو (پرسە) دا لەکاتی پشووی قورئان خوێندن و دەف لێداندا (مەلا ژن) جانتاکەی دەر دەهێنێ و تەسبێحەکانی دەخاتە مزایەدەوەو دەڵێ ئادەی کێ کڕیارە هەیەکەی بە (١٥,٠٠٠) هەزار دینار ئینجا ئافرەتە دڵپاك و ناڕۆشنبیرەکان لێ ی کۆ دەبنەوەو دەست دەکەن بەکڕینی و چەند کەسێك لێ ی دەکڕن لەپاش کەمێکی تر دەڵێ ئەوا کردم بە (١٠,٠٠٠) هەزار دینار وەرن بکڕن لەدواییدا ئەوەندەی مایەوە هەر لەوێ بە (٥,٠٠٠) هەزار دینار ساغی دەکاتەوە (ئەوەیە بە بەردێك دوو چۆلەکە دەکوژێ ) ! !

هەروەها ژنێکی ر قورئان خوێن کە لە هەولێر نیشتەجێیە ، ئەویش بێجگە لەکاری قورئان خوێنی لەناو پرسەدا بەکارێکی تریش خەریکە لەناو (پرسە)دا دەڵێتە ژنەکان کێ دەیەوێ خەونی پێوە ببینم با (٥,٠٠٠) هەزار دینارم بداتێ تاکو ئەمشەو بێتە خەونم و ئاواتەکانی دڵی بۆ جێ بەجێ ببێ و بەم جۆرە چەند ژنێك چەواشە دەکات ! !

وە هەروەها ئەو ئافرەتە قورئان خوێنانە جۆرە سیفەتێکی تریش لەناو (پرسە)دا بەدی دەکەن کە دژی شەریعەتی ئاینی ئیسلامە ئەویش وەك گۆرانی داواکراو هەرچ گۆرانیەکی یان لێ داوا بکرێ لەبەر خاتری پارە دەبێ بیکەن ، هەر وەکو گۆرانیەك هەیە کە تایبەتە بە شیوەن و گریان و بەناوی (کۆچ) کە دەڵێ (دەمەگری مەگری دایە گیان مەگری) باسی لەیەك دابڕان و دەست لەیەك بەردانی دایك و منداڵەکانی دەکات و بەزمی پرسەو کۆڕەکە گەرم دەکات و خەڵکەکەش هەموویان دەست دەکەن بە گریان و شیوەن و ڕۆڕۆ و شەڕ لەگەڵ (مردن) دەکەن کە حەرامە ! !

هەوەها لەکاتی مامەڵە کردندا مشت و مڕی زۆر سەیر لەنێوا قورئان خوێن و خاوەن پرسەدا پەیدا دەبێ کەجێگای گریان و پێکەنینە ، بۆ نموونە ماوەیەك بەر لەئێستا کچێکی گەنج بەکارەساتی سووتان مرد بەلام بەر لەمردنی بردیان بۆ وولاتی (ئێران) و دوو دەفتەریان لێ ی سەرف کرد هەر سوودی نەبوو وە لەکاتی (پرسە)کەیدا مەلا ژن داوای (٧) وەرەقەی کرد خاوەن پرسەش گوتی ئەوەندە زۆرە، مەلا ژن گووتی ئەی بۆچی پارەتان هەبوو (٢) دەفتەری لێ سەرف بکەن لەئێران بۆمن نیتانە ؟!

وە لەناو پرسەی ئافرەتاندا لەسێیەمین ڕۆژدا بەناوی مەولوود کردن بۆ مردوو کە گوایە مردووەکە بەو مەولوودە دەچێتە ناوەندی بەهەشت ، کەدەبێتە ئاهەنگ و زەماوەندو گۆرانی و لاوك و حەیرانی هەمە جۆرو دەف لێدان و هەستانەوەی کۆمەڵێك ئافرەت لەشێوەی بازنە بەستن و قژیان دەکەنەوەو حاڵ دەگرن و کۆمەڵێکیش دەبن بەکۆرس و گۆرانی دەڵێنەوەو لەو لاشەوە نوقڵ و پاقلاوەو بیبسی دەگێڕن و کۆمەڵێ هێلکە لەبەردەم مەلا ژن دادەنێن لەگەڵ هەندێ شەکر بۆ ئەو ئافرەتانەی منداڵیان نابێ ، وە لەپاش تەواو بوونی ئەم کۆنسێرتە دەبێ پارەیەکی زۆر ئەستوور بدرێتە قورئان خوێنەکە، وە بێجگە لەمەش وتارو هوتاف لێدان و مزایەدەی حزبی تێدا دەکەن و بانگەشەی هەڵبژاردن لەبلند گۆوە ساز دەکرێ ! ! ..

لەکۆتایی دا هیوادارم هەر کەسێك بەر لەوەی کاسبی بکات بیر بکاتەوە کە لەپاش مردنی پێ ی دەڵێن (من أین لك هذا) ؟! ئەمەیان زۆر گرنگە هیوادارم بەزووترین کات ئەو پرۆژە بەسوودەی بەڕێز مەریوان نەقشبەندی بەزووترین کات بێتە بواری جێ بەجێ کردن و بەجدی کاری بۆ بکرێت.

# ئەو نەخۆشییە ترسناکەی دووچاری ئافرەتی ڕووت دەبێت چییە؟

ئا. و: شێخ ئاریان عەزیز بەرزنجی

لەگەڵ نوێترین سەرسوڕهێنانیی قورئان و فەرموودەی پیرۆزدا :

پەروەردگاری مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ((فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لايجدوا في انفسهم حرجا مما قضيت و يسلموا تسليما )) سورە النساء ايە ٦٥ , وە پێغەمبەری ئیسلام ((محمد)) ((صلى الله عليه وسلم)) فەرموویەتی :

((نساء كاسيات عاريات مائلات مميلات رءوسهن كأسنمة البخت المائلة لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها)) رواه أبو داود .. نوێترین لێکۆڵنەوەی زانستی سەلماندویەتی کە خۆدانەپۆشینی ئافرەتان دەبێت بەمایەی دەرد و نەخۆشی ترسناک بۆیان ئەوەتا ئامارە زانستێکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نەخۆشی شێرپەنچە (سرطان) ی بڵاو بۆتەوە لەجەستەی بەشێکی زۆر لەو ئافرەتانەی کە جل و بەرگی ڕووت دەپۆشن . لەگۆڤارێکی پزیشکی

> ئەو ئافرەتانەی کە جل و بەرگی ڕووت دە پۆشن. لەگۆڤارێکی پزیشکی بەریتانی ئەو ڕاستییەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەو ئافرەتانە توشی نامۆترین و ترسناک ترین جۆری نەخۆشی شێرپەنچە (سرطان )دەبن کە بێی دەووترێت ((الميلانوما الخبيثة))

بەریتانی ئەو ڕاستییەی ڕوون کردۆتەوە کە نامۆترین و ترسناک ترین جۆری نەخۆشی شێرپەنچە (سرطان ) کە بێی دەووترێت ((الميلانوما الخبيثة)) کە لە پێشودا ئەم جۆرە شێرپەنچەیە (سرطان) ە گەلێك کەم و نامۆبوو بەڵام ئێستا خەریکە بڵاو دەبێتەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەتایبەتیش لە نێوانی ئەو مێینە گەنجانەدا کە جلی کورت لەبەر دەکەن و لاق و باسك و جەستەی خۆیان ڕووت دەکەن و بەر تیشکی خۆر دەکەویت بە شێوەیەکی زۆر . بۆیە تایبەتمەندانی پزیشکی زۆر بوونی ئەم نەخۆشییە دەگەڕێننەوە بۆ بەکارهێنانی جلی ڕووت و خۆپۆشتە نەکردنی ئافرەتان, وە گۆرەوی تەنك و نایلۆن بە هیچ شێوەیەك سوودی نییە بۆ بەرگری کردن لەو تیشکەی بەر ئەوان دەکەوێت , هەروەها ئەم گۆڤارە داوای کرد لە تایبەتمەندانی گەشناسی ((خبراء البيئة)) کە

لێکوڵنەوەی زیاتر ئەنجام بدەن بۆ ئەم جۆرە نەخۆشییە نوێیەی کە خەریکە ببێت بە دیاردەیەکی بەربڵاو و مەترسی گەورەی لێ بکەوێتەوە، ئەمەش ئەو ئایەتە پیرۆزەی پەروەردگاری مەزنمان وەبیر دێنێتەوە کە دەفەرموێت ((وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) سورة الأنفال 32 ئەوەتا ئەو ئازارە توندەی داوایان دەکرد هاتە جێ بۆیان وەیان بەشێکی ئەو ئازارە لەوێوەی ئەو نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان) ە پیسەدا کە ترسناک ترین جۆری شێرپەنجەیە خۆی دەبینێتەوە، و لەزۆربەی کاتدا توشی ئەو جێکایانە دە بێت کە ڕوتی دەکەن و زۆر بەر تیشکی خۆر و تشکی سەرو وەنوشەیی دەکەوێت بە هۆی ئەو جلە ڕوتانەوە کە لە بەری دەکەن وە یان ئەو جلە زۆر ڕووتانەی کە لەسەر لێواری دەریاکاندا لەبەریان دەکەن، دەبینـدرێت زۆربەی جەستەکان دووچاری ئەم نەخۆشییە دەبن بەڵام بە ڕێژەی جیاواز سەرەتا وە کوو پەڵەیەکی گەڵێک پچووک دەردوەکەوێت لە پێ یان لە لاق وە هەندێ جار لەناو چاویشدا دەردەچێت ئینجا بڵاو دەبێتەوە لە هەموو پارچەکانی جەستەدا بەڵام سەرەتا لەو جێگایە بڵاو دەبێتەوە کە لێی دەردەچێت لە یەکەمین جاردا، ئینجا هێرش دەکاتە سەر گرێ ((العقد اللمفاوية)) لەمفاوێکان کە لە سەرووی ڕاندایە وە ئینجا خوێنیش داگیر دەکات و جێگیر دە بێت لە ((جگەر)) دا وە جگەر ویران دەکات بە ماوەیەکی کەم وە هەندێك جاریش جیگر دەبێت لە ناو ئیسك و هەناودا هەر وە کوو کورچیلەکان بەو جەشنەی وای لێ دێت نەخۆشەکەی میزی ڕەش دەکات لە بەر وێران بوونی خانەکانی کورچیلەکانی بە بەشێرپەنجەکە وە هەندێك جار دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ لەناو سکی دایکیدا، وە ئەم نەخۆشییە زۆر لە سەر خاوەنەکەی ڕاناوەستێت وە دەرفەتی ئەوەشی بۆ ناهێلێتەوە کە نەخۆشەکە بە نەژتەرگەری هەڵبستێت بۆ چارە سەرکردنی نەخۆشێکە وە کوو هەندێك لە شێرپەنجەکانی دیکەدا هەیە، وە بە هیچ جۆرێك ئەم نەخۆشە سوود وەرناگرێت لە چارەسەر کردن بە تیشك (( للعلاج بجلسات الأشعة )) ئەلێرانەوە نهێنی و فەلسەفەی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز سەرچاوە دەگرێت بەوەی کە فەرمان دەکات بە ئافرەتان پەیرەوی فەرمانی پەروەردگار بکەن لە باڵاپۆشیدا و جل و بەرگی ڕووت و تەسك و تروسك لەبەر نەکەن بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە خۆیان بپارێزن لە ئەشکەنجەی دونیا کە ئەم نەخۆشییە ترسناك و تۆقینەرەیە و هەروەهاش بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە ئشکەنجەی خوای مەزن لەو دنیادا .. باشە لەدوای ئەو ڕاستییانەی زانستی نوێ سەلماندویەتی وە قورئانی پیرۆزی پەروەردگاری مەزن بیشی هەزار ساڵ زیاتر فەرمانی پێ کردووە ئایە هیچ بیانویەکی تر هەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە تاوەکوو ئستاش پەیرەوی فەرمانی یەزدانی مەزن ناکەن لە باڵاپۆشیدا ...

**سەرچاوە:**

" الإعجاز العلمي في الإسلام والسنة النبوية" محمد كامل عبد الصمد

http://www.maknoon.com/e3jaz/new_page_52.Htm



# بروسکەی سوتێنەر[1] بۆ سەر دوو شوبهەی سەردەم!![2]

# (بۆ چاوساغان تەنها مەشخەڵێك!)

ڕێبەند نوح لەك

ئەم ووتارە بە پوختی پێنج تەوەرەی لە خۆگرتووە[3]:

**یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی یەکەم:** کاکە باش نییە زۆر بزانی چونکە هەرچەندە بزانی ئەوە لەسەر دەبێتە ماڵ وبارگرانی ودەبێت جێ بەجێ ی بکەی!

**دووەم: هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی دووەم:** هەموومان بای مەلایەك دەزانین بەڵام عەمەلمان نییە ! [4]

**سێ یەم: هەڵوەستەی دروست وجدی:** بۆ چاوساغان تەنها مەشخەڵێك!

**چوارەم: با هەست ڕابگرین!**

**پێنجەم: بەڵام نایشارمەوە...**

**هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی یەکەم:**

قسەیەك لەناو خەڵکی عەوام بگرە لە ناو خەڵکی تێگەیشتوو وخوێندەوار زۆر باوە ئەویش ئەوەیە (کاکە باش نییە زۆر بزانی چونکە هەرچەندە بزانی ئەوە لەسەرت دەبێتە ماڵ وبارگرانی ودەبێت جێ بەجێ ی بکەی!) ، ئەمە ئەگەر پەتێك بێت زۆر ئاسانە پساندنی، ئەگەر تاریکاییەك بێت زۆر ئاسانە مۆمێکی پڕشنگداری لێ دابگیرسێنی، ئەگەر بۆچوونێکە زۆر ئاسانە بەرپەرچدانەوەی.....هتد، بەڵام بەمەرجێك ئەو کەسە ئامادەگی ڕاستگۆیانەی هەبێت گوێ بگرێت ودان بە هەق دابنێت. بێگومان بۆ ئەمە وەڵامی زۆر هەیە، ئەمانەی خوارەوە پوختەکەیەتی (کە ئەوەش فێڵێکی ئاشکرای شەیتانە بەڵکو لە بەهێزترینی تەڵەکانییەتی) [5] هەڵبەتە ئەوەش بە زمانێکی زۆر ساکار نووسیومە بەڵام بۆ ئەو کەسانە سوودی نابێت کە دڵیان پەیوەست کردووە بە کۆشك وسەراکانی دونیاوە. [6] بەڵکو بۆ ئەوانەیە تاسەباری[7] قیامەتن وپایە وشەوکەتی دواڕۆژیان دەوێ، بۆیەش هەتاکو ئاگر وفیتنەی دونیا لە دڵ ودەروونمان کپ نەکەینەوە هەر بەو شێوەیە دەبین. هیواخوازم پەروەردگاری بەخشەر ودەوڵەمەند لە ئیخلاص و ڕاست پێکانی دونیا و پاداشتی دواڕۆژ بێبەشمان نەکات، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە بۆ خۆم وپاشان گشت برایان وخوشکانی ئیمانیم (لە پێناو خوا) بە پاڕانەوەی پێغەمبەر (اللهم اهدني واسددني اللهم اني اسألك الهدى والسداد) [8] ئەمانەی خوارەوەش پوختەی بەرپەچدانەوەکەیە:

١- باشە ئەو کەسەی کە نەزانێت، چی تێدەگات وچی جێ بەجێ دەکات، لەچی وچۆن خۆی دەپارێزێت، حەڵاڵ وحەرام وباش وخراپ چۆن جیادەکاتەوە، ئاکامی ئەم بۆچوونەش زۆر ڕوونە کە خەڵکانێکی زۆر تێنەگەیشتوون لە ناوەڕۆکی ئیسلام، زۆر شت دەکەن کە دەبێت خۆیان لێ بپارێزن بەڵام زۆر بەئاساییش ئەنجامی دەدەن، تەحەددا دەکەم کە ئەوانەی ئەو قسە دەکەن زۆربەیان باش وخراپ

وحەلاڵ وحەرام وەك ئەوەی لە ئیسلام باسكراوە تێیگەیشتبن.[٩]

٢- گریمان دامان نا ئەوە زانیشیان كە باش وخراپ كامانەیە، بەلام چۆنیەتی ئەنجامدانی چاكەكە زۆر دوورن (بَعيدين كُلَّ البُعد) لە دەست نوێژ ونوێژەوە كە ڕۆژانە دووبارە دەبێتەوە تاكو گەورەترینی شتەكان كە لە ئیسلام هەیە. ترسناكی ئەم بابەتە لەوە دایە كە مەسەلە عەقیدەییەكان بە پلە یەك دەكەونە ژێر چنگ وبەر هەڕەشەی تەڵەكەبازی شەیتان. جا داخوا بزانم خەڵك نە لە شرك ونە لە كوفر ونە لە نیفاق گەیشتبێت چۆن خۆی لێ دەپارێزێت؟؟! كە ئەوە مەبەستی هەرە گەورەی شەیتانە بۆ موسڵمانان بۆ دزینی بەنرخترین ماڵ وسامانی كە ئیمانەكەیەتی. پاشان (الولاء والبراء) مەسەلەیەكی زۆر وورد وهەستیارە بۆ سەر ئیمان...جا بگرە بە هەموو شتەكاندا بچۆ ئەوكات سپی وڕەش جوان خۆی نیشان دەدات.

٣- جا لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەو قسەیە تەنها بۆ مەسەلەی زانیاری شەرعی بەكاریدەهێنن؟! ئەگەرنا بۆ دونیا وخۆشگوزەرانی هەرچەندە بزانی ئەوە بەلایانەوە كەمە لە سەیارە وتەیارە وبازرگانی و كۆمپیوتەر و بروانامەی بەرز[١٠] و...هتد هیچ كێشە و مشتومڕێكی

**هەموو كەسێك لە دونیادا ماموٚستایەكی هەیە قسەی لێ وەردەگرێ وچاوی لێ دەكات، جا ئەگەر ئەوە لە ڕێگەی زانستێكی پاك وپوختی شەریعەتەوە هەڵنەقوڵێ ئەوە نەفام ونەزانێك یان جەهالەتی سەردەم دەبێتە ماموٚستای كە ئەویش زۆربەی ڕۆژنامە وگۆڤارەكان وسایت وتەلەفزیۆنەكان بگرە دانیشتگا و مەجالیسەكان دەبنە ماموٚستای...**

لەسەر نییە. ئەوەش تەنها ئەوەیە بەبەشی زۆر نەبێ بە دونیا ڕازی نابن بەلام بۆ قیامەت زوهدیان هەیە وبەڵكو زاهیدێكی بێ وێنەن!! دەبێ لەوە دڵنیا بین كە هەر ئیماندارە لە دونیادا خۆی دەڕەنجێنێ لەپێناو دواڕۆژ.

٤-خوای گەورە داوا لە سەرداری گەورە وخۆشەویست دەكات كە داوای زۆر بكات لە دونیا ئەویش تەنها لە زانست (وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا)[١١] هەروەها پێغەمبەریش خۆی دوعای دەكرد بگرە ئوممەتەكەشی فێر دەكات كە بڵێن (اللَّهمَّ انْفَعني بما عَلَّمتَني ، وعَلِّمْني ما يَنفَعُني ، وزِدني علما ، الحمدُ لله على كل حالٍ، وأعوذ بالله من حَال أهل النار)[١٢] جا با بزانین جەهالەتی ئەو قسە پوچە لە كوێ جێ ی دەبێتەوە؟! گەر دەمانەوێ لە ئەزمونگەی دونیا سەلامەت دەربچین ناونیشانی پایەی یەكەمی بۆ ئەوەی بیناسینەوە (احـذَرْ....عَلَيكَ بـالعلْم!) هەر ئەوەشە وەك باڵاڕۆ[١٣] بەرزمان دەكاتەوە.

٥- بێگومان هەموو كەسێك پێ ی خۆش بێت وپێ ی ناخۆش بێت، بیەوێ ونەیەوێ لە دونیا ماموٚستایەكی هەیە قسەی لێ وەردەگرێ وچاوی لێ دەكات، جا ئەگەر ئەوە لە ڕێگەی زانستێكی پاك وپوختی شەریعەتەوە هەڵنەقوڵێ

ئەوە نەفام ونەزانێك یان جەهەلەتی سەردەم دەبێتە مامۆستای كە ئەویش زۆربەی رۆژنامە وگۆڤارەكان وسایت وتەلەفزیۆنەكان بگرە دانیشتگا ومەجالیسەكان دەبنە مامۆستای ئەو، جا چۆن وبەچی رزگاری دەبێت؟ قەناعەت ناكەم كەسی بەسەلامەتی لێ دەرچێت (إلا ما رَحِمَ رَبِّي).

٦- پێغەمبەر(د.خ) هەموو بەیانیان دوعای دەفەرموو (اللهم إني أسألك علما نافعا ورزقا طيبا وعملا متقبلا) [١٤] وە دەشیفەرموو (سلوا الله علما نافعا . وتعوذوا بالله من علم لا ينفع) [١٥] پرسیاری جدی ئەوەیە ئەوە قسەی كێیە؟ (ابن القيم گوتەنی ئەوە فەرموودەی صادق المصدوق الذي لا ينطق عن الهوى) جا ئەوەی نیمچە خوێندەوار وكۆلكە خوێندەواریش بێت تێدەگا یەكەم شت كە داوا لە خوای پەروەردگار دەكات زانستێكی بەسوودە، پاشان سامان ومالێكی پاك وحەلالْ ئینجا كردەوەیەك كە لەلای خوای گەورە وەرگیراو بێت. جوان ورۆشن دیارە ئەو قسەیەی ئەوان دەیلێین [١٦] تەنها وەهمێكە وبەس.

٧- بێگومان ئەگەر یەكێك ئەو زانستە شەرعییەی دەزانی جێ بەجێ ی نەكات ئەی چی جێ بەجێ دەكات یان بلێین ئەگەر كار بۆ دوارۆژ ناكات [١٧] هەر دەبێت كار بۆ دونیا بكات (دیارە كاری دونیا بەلای ئەو باشتر وبەسوودترە لە قیامەت بێگومان بەتەنها ئەو بۆچوونە گومرابوون وریێ لێ وون بوونێكی زۆر ئاشكرایە)

٨- بێگومان لە شوێن كەوتنی پێغەمبەر بێ بەش دەبن [١٨] هەرچەندیشە بانگەشەی ئەوەش بكەن بەوەش لە خۆشەویستی خوای گەورە بێ بەش دەبن (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي) [١٩] ، وە بێبەش دەبێت لە ترسی خوای گەورە (خشیە) كە تەنها زانایانی چاك وپاك بەشیان خۆیان وەرگرتووە (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) [٢٠].

٩- بێگومان خوای گەورە پاشان پێغەمبەر وە پاشانیش زانایان باسی فەزلی زۆری زانستی شەرعییان باسكردووە وە لێرەدا زۆر بەئاسانی دەلێین كەسی نەشارەزا بە شەرعەوە لە هەموو ئەو فەزلْ وگەورەییانە بێبەشە. زانایانی پێشین زۆربەیان خۆیان نیوەسووت [٢١] كردووە لە پێناو زانستی شەرعی! بەلام كێ باسی نەزانینی كردووە وبەسەریدا هەلگوتبێت؟! [٢٢]

١٠- ئەو كەسانەی كە نەشارەزان لە هەموان زیاتر گیرۆدەی خورافیات وبیدعە دەبن كە ئەوەش تەلەی دووەمی شەیتانە پاش شیرك وكوفر (خوای گەورە پەنامان بدات) بەجۆرێك شتی وا دەكەن و وا دەلێن لە هیچ سەردەمێكی مێژووی ئیسلامی وا نەووتراوە ونەكراوە ونەشنووسراوە!!؟ [٢٣] بگرە بە پێچەوانەی شوێن كەوتووانی سونەت پێش پێغەمبەر دەكەون؟!

١١- هەر كەسێك نەشارەزا بێت لە شەریعەتی خوای پەروەردگار وەكو ئەوەی كە پێویستە بێگومان لە هەلسەنگاندنی خۆی وغەیری خۆی بەهەلەدا دەچێت، چونكە پێوەرە راستەقینەكانی لا نییە كە قورئان وسونەتە، بەلكو پێوەری ئەو قسەی خەلكە بۆی [٢٤] ، وە زۆر جاریش پەشیمان دەبێتەوە لە هەلسەنگاندنی خەلكانی دەروبەری وە لەوە دلنیا دەبێت كە زۆریش بەهەلەداچووە هەلبەتە ئەوە گرفتی زۆری بۆ دروست دەكات بۆ دونیا ودوارۆژی وزیانمەند دەبێت.

١٢- هەموو مرۆڤێك دوو نەخۆشی خوارسكی (فطري) یان هەیە ئەویش نەزانی وستەم كردن [٢٥] بە دەقی قورئان (إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا) [٢٦] بۆیە دەبێت هەردوو نەخۆشیەكەی چارەسەر بكرێت، نەزانینەكەی بە علم ویەقین وە ستەمەكەشی بە ئەنجامدانی عیبادەت وترسان لە خوای پەروەردگار.

١٣- هەلگرانی ئەم بۆچوونە دەبنە ویارمەتیدانی دوژمنانی ئیسلام بۆ بلاوکردنەوەی شوبهە بێ بنەماکانیان، کاتێك نەوەکانی ئەم ئوممەتە خالی بوون لە هەلگرانی زانست وزانیاری، هەربۆیەش نەخۆشی شوبهە وگومان تەنها بە زانست چارەسەر دەکرێت[٢٧].

١٤- کاتێك زانستی شەرعی نابێتە پێوەر وسەرچاوە بۆ بیروباوەڕ وکردەوەی چاك ئەوا شەیتان داو وتەلەی خۆی پوخت دادەنێتەوە لە جیاتی گەڕانەوە بۆ قورئان وسوننەت و ووتەی زانایانی لەخواترس ، ختورە ئەوندێشە و وەسوەسەی شەیتان (خواطر وهواجس الشیطانیة) دەبێتە تەرازوو، جا دەبێت بزانرێت هەرچەندە مرۆڤی ئیماندار لەخواترس وپیاوچاك بێت نەگەڕێتەوە بۆ دوو بنچینە سەرەکییەکە ئەوا بێ دوودلی کەسێکی گومڕایە وسەری لێشێواوە.

**هەلوەشاندنەوەی شوبهەی دووەم:**

هەمان ئەو چینە دەلێن (هەموومان بای مەلایەك دەزانین بەلام عەمەلمان نییە!؟؟) ئەو شوبهەش کە دەکەوێتە بەر نەشتەری زانست وتینی بروسکەی تەرازووی قورئان وسوونە دەسوتێت وهەلا بەهەلا دەبێت وئەو تروسکاییە قەلبەیەی کە بەبەری داگرابوو خامۆش دەبێت وهەر بە یەکجاری دەبێتە تاریکستانێکی واقعی:

١- بێگومان لەوانەیە زۆر شتیان سەبارەت بە زانستی شەرعی گوێیان لێبوبێت بەلام زۆر زیاتریشیان گوێ لێ نەبووە[٢٨]، چونکە زانستی ئاخیرەت زۆر بەرفراوانە بەشێوەیەك دەریایەکی زۆر قوڵە کە نە بنی هەیە ونە کەناری هەیە!! (البَحر لا قَعْر و لا ساحِلَ لَهُ).

٢- پرسیاری جدی ئەوەیە: ئایا ئەوەی گوێشیان لێبووە، تێگەیشتوون؟ وە تێگەیشتنەکەیان وەکو خۆیەتی کە خوا وپێغەمبەرەکەی مەبەستیانە؟!

٣- وە ئەگەر داشمان نا تێگەیشتوون، ئەوا دەبوایە جێ بەجێ ی بکەن واتە کاری چاکەی بەدوا دابێت گەرنا زانست کاتێك سوودی بەدوادبێت گەر نا سوودەکەی لە کوێدایە.

٤- ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر لەسەر باری پێشووی خۆیان بمێننەوە، هیوایان بە لێخۆشبوونی خوا هەیە لەکاتێکدا کاری چاکە ئەنجام نادەن ئیمام غزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبە بەنرخەکەی (إحیاء علوم الدین) دەفەرموێ (خوایە پەنات پێدەگرم لە هیوایەك کە وا بکات لەکارم بخات) بێگومان ناشبێت کاری چاکە ئەنجام بدەین وبێ هیواش بین بەلکو دەبێت کاری

**هەموو مرۆڤەکان دوو نەخۆشی خواڕسکی ( فطري ) یان هەیە ئەویش نەزانی وستەم کردنە، بە دەقی قورئان ( إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ) بۆیە دەبێت هەردوو نەخۆشیەکەی چارەسەر بکرێت، نەزانینەکەی بە علم ویەقین وە ستەمەکەشی بە ئەنجامدانی عیبادەت وترسان لە خوای پەروەردگار**

دەستەیەکی کاریگەر بۆ ڕێگەدان

جـــکە بکـــەین بەجدییـــەوە[٢٩] بـەڵنیش هیوامـان بـە لێخۆشبوونی خوای گەورە هەبێت هەروەها ترسـی ئـەوەشمان هـــەبێت کـــە خـــوای پەروەردگار لێمان وەرنەگرێت ئەگەر نـا غـەیری ئـەوە هـەمووی خـەیاڵ پلاوییە.

**هەڵوەستەی دروست وجدی: بـۆ چاوساغان تەنها مەشخەڵێك!**

ئـەو مەشخەڵە ناوازەیـە بریتییـە لـە سـروش (وحـی) خـوای گـەورە کـە خـــۆی لــــە قورئــــان وســــوننە دەبینێتـــــەوە[٣٠]، ئــــەوەش بـــۆ چاوسـاغان وەکـو ڕووناکی یـەکی بەرفراوان وایە بۆ چاوی مرۆڤـەکان، چـونکە مـرۆڤ بـەبێ وەحـی خـوای گـەورە وەك چاوێکە بـەبێ ڕووناکی بێگومـان ئـەوکات چـاو هـیچ ڕۆڵێـك ناگێڕێت بگـرە نـەبوون وبـوونی وەك یەکن، بۆیە ڕێگای ڕاست بریتییە لـە فێربـوونی زانسـتی بەسـوود پاشـان ئەنجامدانی کاری چاکە بـە ئـیخلاص ومتابعەوە، تـەنها ئـەو ڕێگایـە هەیـە وهیچـــی تـــر، بێگومـــان ئـــەوەش دەتوانین بەدەستی بهێنن لـەڕێگای گـوێ گـرتن وخوێندنـەوە وخوێنـدن لـەلای مامۆسـتایەك بـە شـێوەیەکی مەنهەجی.

**با هەست رابگرین!**

زۆر کەس زۆر هەست لـە ئامۆژگـاری وقســەی خێـر وقورئــان ڕادەگرێـت بـەڵام (بەداخـەوە) تەماشـا دەکـەین هـیچ بەرهـەمێکی نابێـت، هەڵبەتـە ئەگەر داری باغـەوانێك بوایـە (کـاکی باغـەوان) عـەیامێك بـوو ئـەو دارەی بڕیبـــوەوە، جـــا بیربکـــەوە و زۆر ووردبـەوە. بـەڵام دەبێـت ئـەو دارە نەخۆشـی یـەکی کوشـندەی هـەبێت گەرنا بۆ بەرهەمی نییە؟! وە ئەگەر بـەو شـێوەیە بـڕوات دەمرێـت (پـەنا بەخوای گەورە) ابن القیم (ڕەحمەتی خـوای پـەروەردگاری لێ بێـت) لـە پەرتوکـە بەناوبانگەکـەی (مــدارج السـالکین) دەفـەرموێ: گـوێ گـرتن سێ قۆناغی هەیـە (بێگومـان ئەگـەر بە هەر سێ قۆناغدا تێپەڕی سـوودی دەبێت) بە گـوێ گـوێ گـرتن، بـەدڵ گوێ گرتن، پاشان وەرگـرتن وقبـوڵ کردن بە کردەوە ئەنجامدان.

**بەڵام نایشارمەوە.....!**

لە کۆتاییدا دەڵێم: بێگومـان کـەس ناتوانـێ لـە پلـە وپایـەی زانسـتی بەسوود بەگشـتی وزانسـتی شـەرعی بەتایبـەتی کـەم بکاتـەوە، بـەڵام ئەوەش ناشارمەوە کە هەنـدێك جـار نـــەزانین دەبێتــــە نیعمـــەت واتـــە نەزانینەکـــە باشـــتر دەبێـــت لـــە زانینەکـــەی، چـــونکە هەرچـــەندە نەزانین دەردی زۆر کوشندە بۆ مرۆڤ دروسـت دەکـات[٣١] بـەڵام جـاری وا هەیە دەردەکە زۆر ترسناکتر دەبێت بەڵکو سزاشی لـە دونیـا ودوارۆژ زۆر سەختترە[٣٢].

> **ابن القیم:**
> **"گوێ گرتن سێ قۆناغی هەیە (بێگومان ئەگەر بە هەر سێ قۆناغدا تێپەڕی سوودی دەبێت) بە گوێ گوێ گرتن، بەدڵ گوێ گرتن، پاشان وەرگرتن وقبوڵ کردن بە کردەوە ئەنجامدان"**

## پەراوێز:

١- بروسکەی سوتێنەر: صواعق محرقة

٢- لەوە دەچێ ئەو دوو شوبهەیە زۆر نوێ نەبن، بەڵام ماوەیەکە بەمێشکم دا دێت ودەچێت بۆیە ویستم چەند تێبینی یەکی خۆمی لەسەر بنووسم.

٣- هەڵبەتە ئەم ووتارە پێویستی بە پێشەکی ورێخۆشکردنێك هەبوو بەڵام لەترسی زۆر درێژبوونەوەی ئەم نووسی.

٤- هەردوو شوبهەکەش بە دەربرینی خەڵکی نووسیومە بۆ باشتر وئاسانتر تێگەیشتن.

٥- چونکە نەزانی وجەهل باشترین وبەهێزترین تەڵـەی شـەیتانە بـۆ لـە خشـتەبردن وهەڵخلیسکانی مەترسیدار!!

٦- چونکە خوای پەروەردگار لە نامە گەورەکەی خۆیادا فێرمان دەکات کە پەرێ دووەم هەڵنەدەینەوە تاکو (هدى للمتقين) نەخوێنینەوە، بۆیە ئەگەر ئەو سیفەتە لەخۆت بەرجەستە نەکەیت ئەو قورئانە سوودی بۆت نابێت ونابێتە بەڵگە بۆت بەڵکو دەبێتە بەڵگە لەسەرت؟!

٧- تاسەبار: ئارەزوومەند

٨- صحيح ابن حبان، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم

٩- زۆربەی جاریش ئەوانە دەبنە بەردی بن گۆم وشەیتانێکی کەرولاڵ بەڵکو لەوەش زیاتر پێنە دەکەن بەڵام پێنەی زۆر سەیر بۆ قسە وکرداری ناشەرعی خەڵك (خوای پەروەردگار بمانپارێزێت بە پاراستنی خۆی...اللهم امين)

١٠- بێگومان ناز ونیعمەتەکانی دونیا لە سنوری شەرع هیچ ڕێگریەکی لێ نەکراوە بەڵکو مرۆڤی ئیماندار دەبێت هەموو ئەوانە بەگەڕبخات وەك هۆکارێك بۆ بانگەوازی دینی خوای گەورە وگەیشتنی بە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار.

١١- سورة طه/١١٤

١٢- أخرجه الترمذي، قال الشيخ الألباني حديث صحيح دون قوله والحمد لله

١٣- باڵاڕۆ: مەصعەد

١٤- سنن ابن ماجه، قال الشيخ الألباني حديث صحيح

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، قال الشيخ الألباني حديث حسن

١٦- ئەوقەناعەت وبیروباوەڕەی ئەوان هەیانە تەنها پوش وپەڵاش وخەونی زیندووە!

١٧- ئەوانەی بە کاری چاکەی کەم بۆ دوارۆژ ڕازین ئەوانە زاهیدی قیامەتن نەك دونیا؟!

١٨- باشە نازانن پێغەمبەر بەکوێدا ڕۆیشتووە چۆن شوێنی دەکەون؟!

١٩- سورة ال عمران، ٣١

٢٠- سورة فاطر، ٢١

٢١- ئیوەسووت: شتێك نیوەی بسوتێت (بۆ نا؟!) دەبینین پێشینانمان بە مانگ ڕۆیشتوون بۆ بەدەست هێنانی یەك فەرموودەی پێغەمبەر، کێ ئەوە دەتوانێت بەراورد بکات لەگەڵ ئەوەکانی موسڵمانی ئەمڕۆ (بێگومان زۆر ئەستەمە!)

٢٢- تەنها با ناوی یەك کەسی (معتبر) م پێ بڵێن؟! بێگومان نییە....

٢٣- لەوە دەچێ نموونە زۆر بێ بەڵام ئەوە پێویستی بە چەندین زنجیرە ووتار هەیە، بۆیە بۆ دەرفەتێکی تر بێت ئەگەر خوا تەمەنی دا وگونجا.

٢٤- کاتێك خەڵك بە پیاوچاك وصالحی دادەنێت ئەویش (لەوانەیە!) دونیایەك پۆخڵی پێوەیە، بەڕاستی فیتنەیەکە وکەوتۆتە گۆماوەوە وخزاوە.

٢٥- هەردوو ڕووەکەی ستەم: ستەم کردن لە خۆت کە تاوان ئەنجام دەدەیت وتەوبەی ڕاستەقینە ناکەی، وە ستەم کردن لە خەڵکی بە ئازاردان وماڵ خواردنیان بەناهەق و...هتد.

٢٦- سورة الأحزاب، ٧٢

٢٧- جێ ی خۆیەتی دەست خۆشی وپێزانینی خۆم ئاراستەی "پرۆژەی تیشك" بکەم کە بۆتە درکێك بۆ چاوی نەیارانی ئیسلام کە چاویان بە ئیسلام هەڵنایەت! وە نەشتەرێکە هەموو پیلانەکانیان تەفروتونا دەکەن (لەوانەیە ئەوە ڕاست بێت کە نووسین بە نووسین وەڵام بدرێتەوە...هتد)

٢٨- مەبەستم زیاتر ئەو زانیاریانەیە کە بە پێویست و واجب دانراوە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان بیزانێت وجێ بەجێشی بکات.

٢٩- وە زۆر خۆشمان لە تاوانەکان بە بچوك وگەورەیانەوە بپارێزین چونکە (لا تنظر الى صغر المعاصي ولكن انظر الى من عصيت)

٣٠- بێگومان ووتەی زێڕینی زانایان کە لە قورئان وسوننەیان هەڵهێنجاوە دەبێتە بەشێك لەوەی ئیمانداران پشتی پێببەستن لەکاتێك کە بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ (ادلة صريحة) بەدی ناکەن. (زانایان یەکێکن لە گەورەترین ودیارترین نیعمەتەکانی پەروەردگار، دەبێت هەستی پێ بکەین سوپاسی خوای پەروەردگار بکەین)

٣١- بێگومان نموونەی زۆرمان هەیە کە لە فەرموودەی صەحیح هاتووە صەحابە (ڕەزا وڕەحمەتی خوایان لێ بێت) بۆ نموونە لە نوێژدا هەڵەی کردووە بەهۆی نەزانینەوە، پێغەمبەر فەرموویەتی (إرجِعْ فَصَلِ فإنَّكَ لم تُصَل) ئەی فیتنە چییە، ئەگەر ئەوە فیتنە نەبێت؟ وە چەندینی تر کە دەرفەتی ئەوە نییە.

٣٢- جا ئەم بابەتە بە ئیزنی خوای پەروەردگار (إن قدّر الله البقاء) بۆ ژمارەی داهاتووی گۆڤارەکەتان ووتارێکی بۆ ئامادە دەکەم لە ژێر ناونیشانی (ئەو کاتەی نەزانین دەبێتە نیعمەت!!؟)

reband.n.lak@gmail.com

# کتێبێکی تازە دەڵێت ئەسحابەکانیش ئەنفالی کوردیان کردووە!

مسعود عبدالغالق

بە ناونیشانی (ئەنفال لە ڕۆمانی کوردیدا) بەڕێز د.احمد شریف وەزیری پێشووی ناوەخۆی هەریم توێژینەوەیەکی لە بارەی ئەنفال کردووە بەهۆیەوە دکتۆرای پێ وەرگرتووە، هەرچەند ئاشنا نیم بە مێژوو هەڵس و کەوتی بەڵام مادام وەك بەرپرسانی تر نەچووە خۆی خەریك بکا بە گەندەڵی هاتووە خۆی بە بابەتێکی گرنگی وەك ئەنفال ماندووکردووە دەست خۆشی لێدەکەم، لەگەڵ ئەوەشیمە کە دەڵێت دەبێ نەوەکانمان بە جوانی فێر بکەین کە ئەوەی عەرەب بەناوی ئایینیەوە دژ بە کورد کردوویانە و دەیکەن بۆیان پەردە پۆش نەکرێ، بەڵکو دەبێ ئەو ڕاستیانە هەڵماڵرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوانەی خوارەوەیان نیم کە بێ زانیاری تێ ی کەوتووە:

١- لە (ل٢٢) دەڵێت "کورد هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی لە ناوبردن و جینۆسایدا بووە لە لایەن عەرەبە ڕەگەز پەرستەکانەوە لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا..." ئەگەر نوسەر مەوداکەی دیاری بکردایە بیووتبایە لەوەتەی دەوڵەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢١ ەوە دروست بووە ئەوە قسەکەی ڕاست دەردەچوو، بەڵام ئەو ڕەچاوی زەمان و مەکانی نەکردووە و دەڵێت لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا، ئەو ڕایەش سەرومێشکی بەشی هەرەزۆری سیاسەتمەدار و ڕەوشەنبیرانی کوردی گرتۆتەوە، بۆیە لەسەرەتای زۆربەی کتێب و پرۆگرامەکانی خوێندنی باڵا بە عیبارەی ((کوردستان هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە)) دەست پێ دەکەن، کە نە ئەوە نە ئەوەی سەروو هیچ بنەچەیەکی ڕاستی لە مێژوودا نیە، باجارێ لە هاتنی ئەسحابە گەڕێین کە چۆن هاتوونە کوردستان یان هەر نەهاتوون، بۆچی ڕەوشەنبیرانی کورد بەو چاوە سووکە تەماشای مێژووی خۆیان دەکەن هەر داگیرکراو مەزلوم بووینە، ئایا چەندە ڕاستە مێژووی کورد هەر گریان و پاڕانەوە و هاوار بووە، ئەگەر وابێت ئەوا ئێمە داوای مافی چ لە تورکیاو ئێران و عێراق و سوریا دەکەین مادام لە مێژوودا هەر ژێر دەستەو دابەش و چەوساوە بووبێت؟ ئەوەیان لە ڕووی یاسایی و سیاسی پاکانەیە بۆ داگیرکەران، لە ڕاستیش دا وانیە، کورد لە مێژوودا بەتایبەتی لە دوای ئیسلام تا ناوەڕاستی سەدەی ١٩، سەرجەم (٦٤) دەوڵەت و میرنشین و ئیمپڕاتۆری هەبووە، لەهەموو عەرەب(٣)ی هەبووە، (توماس بوا) لە کتێبی (تاریخ الاکراد ص١٩١ دەڵێت: بەدرێژایی تەمەنی خەلافەت کورد سەربەخۆ بووە جگە لە هەندێ دۆخ نەبێت، ئینجا کوا بۆ یەك جاریش عەرەب هاتبێ کوردستانی داگیر کردبێ، بەڵام دەسەڵاتی کوردی بەلای کەم (٥) جار بەغدایان داگیر کردووە، سەرجەم بەغدا بەبێ

بەرگری زیاتر لە (٣٠) جار بەبێ بەرگری لەلایەن سەفەوی و عوسمانی و کورد و مەغۆل و ... خەڵکی تر داگیر کراوە، لە دوای عەباسی حوکمی عەرەب هەر نەبووە، لە١٣\١٠\١٩٣٢ سەعات (١١,٥) دەقیقە عێراق وەك یەکەم دەوڵەتی عەرەبی (مونتەدیب) بووە ئەندام لە (عصبة الأمم) بەوبۆنەیەوە سکرتێری (عصبة) (مسیۆ پۆڵتس) ووتەیەکی خوێندوە و ووتی ئەوە ماوەی شەش سەدەیە عەرەب ژێر دەستەن و ئێستا وارزگار دەبن، عبدالرحمن بزاز لە کتێبی (العراق من الأنتداب الی الأستقلال) ئەو مەسافەیە زیاد دەکات و دەڵێت عەرەب ماوەی (٨) سەدەیە سەربەخۆییان بەخۆوە نەدیوە، ... دەتوانین هێشتا مەسافەکە لەوانەش زیاتر بکەین: کوا کەی دەسەڵاتی عەرەبی عێراقی لە مێژوو دا بینراوە تا کوردیان چەوساندبێتەوە یاخود هەڕەشە بووبن، بە پێچەوانەوە زۆربەی عەشایرە عەرەبەکانی ناوچەکە جاشی کوردان بووینە بەناوی (سواریچە) ... لەگەڵ سەدان ڕاستی تر لەو بارەیەوە ... کوا تاکە بەڵگەیەکت نیە بۆ ئەو قسە گەورەیەت، لەوەوەش بۆمان دەردەکەوێ زۆربەی نووسەر و سیاسەتمەار و ڕەوشەنبیرانی کورد

**ناشیونالیزمی عەرەب و تورك بە ساختەو زۆرزانانە ڕەگی نەتەوایەتیان قوڵ دەکەنەوە بۆ بنەبانی مێژوو، کەچی کورد بە فەقیرحاڵی و نەزانانە ڕەگی مەینەتیەکەیان قووڵ دەکەنەوە بۆ بنەبانی مێژوو، وەك نووسەر تێکەوتووە و دەڵێ کورد لەسەر دەستی عەرەب و تورك و عەجەم لەهەموو سەردەمەکان چەوسایتەوە تا لە سەدەی ١٦ دابەشیش کرا!!!**

بەپێ ی واقیعی ئێستا حوکم لەسەر مێژوو دەکەن کە هەڵە دەردەچێ دەردەکە ئەوەیە.

٢- لە (ل٢٣) دەڵێت "ئاشکرایە کورد لە ماوەی ١٤٠٠ ساڵی ڕابوردوو چەندین جار ئەنفال کراوە، ئەنفالی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٦ی کۆچی کە کوردستانیان داگیر کرد لەلایەن لەشکری ئیسلام" لە (ل٢٤) دەڵێت "ئەو ئەسحابە ڕووت و برسیانە بە کوردستان وەربوون و تالانیان کرد" لە (ل٢٥) ڕاستەوخۆ دەڵێت "دەتوانین بسەلمێنین کە ئەنفالی یەکەم لەوسەردەمی دەستی پێکرا کوردستان بە جارێك وێران کرا، کچ و ژنی کورد بەدیل گیرا و ئەسحابەکان بۆخۆیان دەستیان بەسەرداگرتن وەکو کچە ئەنفال کراوەکانی گەرمیانی سەدەی بیستەم" ... بەڵگەش سێ سەرچاوەی زۆر سەیر، یەکەمیان: پێستە تەزویرەکەی هەورامان، دووەم: کتێبی ظهور الکورد، د. جمال رشید، سێ یەم: معروف ڕەسافی...!

لە ڕاستیدا نووسەر وەك زۆربەی ڕەوشەنبیر و سیاسەتمداری عەلمانی سەردەمی ئەنفالی یەکەم دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی (فتح)ی ئیسلام لە سەدەی (١٦)، بەوەش خزمەتێکی گەورەی بەعس دەکەن و پرۆسەی ئەنفال تەئسیل دەکەن و

شـەرعیەتی مێـژووی ئـاینی پـێ دەدەن کە نیەتی لەو سەردەمە ئەو تێ بینیە گرنگە لە سەرتاسەری ئەدەبی نیشتمانی کوردی بەدی دەکرێ کە هەرچی داگیرکەر دەیڵێ و دەیکاتە پاساوی ڕەگەز پەرستی و داگیرکاری بۆ کوردستان لای ئەکادیمیای کورد بە (حەق) وەردەگیرێ، بۆیان تەواو دەکەن، لەسەر ئەو بنچینەیە کورد کەوتۆتە هەڵەیەکی مەزن، هەڵەکەش ئەوەیە: ناشیونالیزمی عەرەب و تورك بە ساختەو زۆرزانانە ڕەگەی نەتەوایەتیان قوڵ دەکەنەوە بۆ بنەبانی مێژوو، کەچی کورد بە فەقیر حاڵی و نەزانانە ڕەگەی مەینەتیەکەیان قووڵ دەکەنەوە بۆ بنەبانی مێژوو، وەك نووسەر تێکەوتووە و دەڵێ کورد لەسەر دەستی عەرەب و تورك و عەجەم لەهەموو سەردەمەکان چەوسایتەوە تا لە سەدەی ١٦ دابەشیش کرا!! بۆ هەموو ئەوانەی دکتۆراکەی نووسەر و ماستەرنامەی (بەئیسلامی کردنی کورد)

لە پێش هاتنی ئیسلام کورد لە بارودۆخێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی زۆر سەخت بوو، کوردستان دابەش کرابوو، هەموو مەزهەبی (مەزدەکی و مانی و زەردەشتی) یان لە نێو بڵاو کرابۆوە، کیسرا خاوەنی (٣٠٠٠) ژن بوو هێشتا نامەی بۆ کێخوا کانی مەرگە دەنارد ئەگەر کچی جوانیان هەبێ بۆ کسرا بنێرن، بۆیە کورد چاوەڕوانی ڕزگارکەرێکی دەکرد، پرسیارەکە ئەوەیە ئەگەر کوردیش شەڕی کردووە دیفاعی لە چی کردووە؟ لە کام دەسەڵاتی کوردی؟ خۆ ئەوکات داگیرکراوبوو- ئەگەر شەڕی کردبێ جاش بووە.. تکایە ئاگاداربن ئەسحابە نەهاتنە کوردستان، کورد ڕزگاریشی بوو بێ ئەوەی سوپای عەرەب بێتە کوردستان، لەو ڕووەوە زۆربەی مێژوو نوس و توێژەرەکان یەکڕان کە کورد بە خۆشی ئاینی ئیسلامی وەرگرتووە نەك زەبری شمشێر وەك عەرەب، هەر لە سەدەی ١٤-١٦ لە ڕێ ی گابانی کوردی و نەوەکانی ڕێکخستنی ئیسلامی هاتە کوردستان، لە شەڕی قادسیە (دێلم) خۆی و هێزەکەی جەنگەکەیان یەکلا کردەوە کەئێستا بەداخەوە (سعد) ناوزەد دەکرێ، لەو ڕووەوە مێژوونووسە عەرەبەکانی نوێ و هەندێکی کۆن بێ ویژدان بووینە لە نەقل کردنی جەنگی قادسیە و کەم کردنەوەی ڕۆڵی (دێلم)ی کورد و (٥٠٠٠) جەنگاوەرە ئازاکان کە ڕۆستەمیان شکاند، ئیتر لەوکاتی لەشکری عەرەب گەڕانەوە نەك بۆ کوردستان هەر بەرەو بەغداش نەهات - هەمووی تەسلیمی لە شکری دێلم کرا و ئەو لەشکرە ناونرا (جیش الحمـرء)، هەر ئەوان والی کوردستان و حەرانیان دانا، لە شکستەکەی قادسیە لەشکری فارس شکا، کە لەشکری (دێلم) ڕووی لە دیالە کرد هەموو لەشکری فارس ناوچەکەیان بەجێ هێشت، بەوشێوەیە لە کوردستان شەڕی کورد و ئەسحابە هەرگیز نەکراوە، مەسەلەی دۆڵی ئەسحابە و بەردەقارەمانی ئیمامی عەلی زۆربەی ئەو ناوانە ئەسڵ و ئەساسی نیە کە نووسەر پشتی پێ بەستووە، ئیتر لەوکاتیەوە مێژووی سیاسی ڕاستەقینەی کوردستان لە دەوڵەت و شارستانی و تەعلیم و ئەدەب دەستی پێ کردووە، ناوەناوەش دووچاری داگیرکاری بووە، هەم کوردیش خەڵکی داگیرکردووە، لە کتێبە ئیسلامیەکان لە یەك شوێن لە کتێبی (ابن خلدون) و (ابن کثیر) بە ئەدرێسی (غـزوة الأکـراد) هاتووە، ئەویش شەڕێك بووە لەلای خۆسزستانی ئێستا لەسەر کوردستان نەبووە، کورد بەشداری هەندێ شەڕی تری کردووە هەمووی لە (دەوروبەر) بووە نەك لەناو جەرگەی کوردستان.

لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسی دەسەڵاتیان لە کوردستان نەبوو بۆیە معارەزەکانیان لە کوردستان دەحەوانەوە، کتێبی (الملل و النحل والاعـراق ص٢٧١) دەڵێت تەنها

سەرۆکە کوردەکان بەنامەیەك (لایەنگر) یان بۆ دەناردن و کۆتایی دەهات، لەگەڵ سەلجوقیەکانیش کورد ڕێکەوتنی هەبووە، لەگەڵ عوسمانیەکانیش لە ساڵی ١٥١٤ ەوە ڕێکەوتنی کورد و عوسمانی بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٢٦ وەك کۆلونیل ئیفلسنتون دیاری کردوە و دەڵێت و بووە هۆی زیادکردنی (١١) میرنشین و دەوڵەتی تر.

نووسەر لەو هەموو ڕاستیە لایداوە هاتووە پشتی بەو (پێستە) بەستووە کە بەڕای هەموو عەقڵ مەندێك تەزویرە، ئەو ووشانەی کە لەسەری نوسراون گوزارش لە ووشەی کوردی سەردەمی ئەسحابە ناکا لە (موسوعەی جودی) بەووردی ناسنامەی ئەو پێستە و ناسنامەی ووشە و عیبارەکان دیاری کراوە، لەوێ باسی ئەوەمان کردووە کە ڕەنگ بێت ئەو پێستە بەکاربهێنرێت و ئەوە بەکار هات.

ئینجا لەو هەموو کتێبە مێژوویانە چووە پشتی بە (معروف رەسافی) و (د. جمال رشید) بەستووە، هەموو کەس دەزانێ معروف رەسافی مارکسیەکی نەشارەزا بوو، ئایینی بەکار دەهێنا بۆ بڵاوکردنەوەی شوعیەتی، لەپێشەکی ووتار و ئاهەنگ قورئانی دەخوێند، کتێبی (نداء الألهی للینین) ی بڵاوکردەوە هەموو گیانی ساختە بوو.

٣- لە (ل٢٣) باس لە ڕووداوێك دەکا گوایە (عومەری کوڕی خەتاب) بەو شێوە ناشیرنە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەو دوو کچەی (یەزدەجورد) کردبێت، دادگەری عومەر بەناوبانگە لە هەموو جیهان، ئینجا ئەوە پەیوەندی بەسەرهەڵدانی شیعە نیە لە ئێران، بەڕوونی دیارە نووسەر شارەزایی مێژوویی لاوازە، ئەگینا مەزهەبی شیعە بەهۆی هەستی نەتەوایەتی فارسی سەری هەڵنەداوە، ئینجا یەکەم جار شیعە لە ناو عەرەب و لە عێراق سەری هەڵدا نەك لە ئێران، لە ڕاستی دا ڕەگەز پەرستیەکی نەفامی لە نێو دەسەڵاتی ئەمەوی و بەشێك لە فیقهیی ئیسلامی سەری هەڵدا زاراوەی وەك (موالی) و (شعوبی) تەنیەوە، لەسەر ئەو بنچینەیە بەشێك لە مێژوونوسە عەرەبەکان کە پێیان دەگوترا (وعاظ السلاطین) هەوڵیان دەدا هەر کارێکی ناشرین بێت لە عەرەب دووری خەنەوە بیدەنە پاڵ عەجەم، بەڵام (ابن خلدون) خۆشی عەرەبە ڕاستیەکانی ئاشکرا کردووە و دەڵێت عەجەم تەعمیری دەکرد و عەرەب تێکی دەدا و دەڵێت زاناکانی ئیسلام هەتا زمانناسانیش بە دەگمەن عەرەبێکی تیا نیە.

٤- لە (ل٢٧) نووسەر تەقەلایەکی زۆری داوە (بەبێ ئیرادەی خۆی)

**لەو هەموو کتێبە مێژوویانە چووە پشتی بە (معروف رەسافی) و (د. جمال رشید) بەستووە، هەموو کەس دەزانێ معروف رەسافی مارکسیەکی نەشارەزا بوو، ئایینی بەکار دەهێنا بۆ بڵاوکردنەوەی شوعیەتی، لەپێشەکی وتار و ئاهەنگ قورئانی دەخوێند، کتێبی (نداء الألهی للینین) ی بڵاوکردەوە هەموو گیانی ساختە بوو**

> **نووسەر تەقەلایەکی زۆری داوە (بەبێ ئیرادەی خۆی) هەقی (ئەنفالی کورد) بداتە حزبی بەعس و بڵێت کورد لە مێژوودا هەر ئەنفال کراوە بۆیە ئەوەی حزبی بەعسیش ئاسایی بوو، تەقەلای ئەوەی نەداوە ئەو کارەی بەعس بە قێزەون و شاز پێشان بدا**

هەقی (ئەنفالی کورد) بداتە حزبی بەعس و بڵێت کورد لە مێژوودا هەر ئەنفال کراوە بۆیە ئەوەی حزبی بەعسیش ئاسایی بوو، تەقەلای ئەوەی نەداوە ئەو کارەی بەعس بە قێزەون و شاز پێشان بدا، ئەو بۆچوونە بە سانایی ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە کورد شایستەی ئەنفال بێت مادام ئەوەندە جارە وایلێکراوە، لە ڕاستیدا وانیە هیچ جار ئەوە ڕووی نەداوە، بەڵام گومان لەوە نیە جارجار سوپای مەغۆل و عوسمانیش (هەر چەندە بە زەحمەت تر) بەڵام لە هەمان کات کوردیش وای لە میللەتانی تر کردووە، کورد خۆبەخۆش یەکتریان داگیر کردووە.

نووسەر لەو تەقەلایانە کارت و بابەتەکانی زۆر خراپ تێکەڵ کردووە، گوناحی کەمالی بە مل عوسمانی داهێناوە، جێگەی داخە لە زۆربەی پرۆگرامی خوێندنی باڵای عەرەب و کوردستان و نووسەرە باڵاکانیشمان جیاوازی لە نێوان فەترەی دوای ١٩٠٨ و پێش تر ناکەن، لەو ڕووەوە دوو نمونە باس دەکەین: یەکەم: د. فەرهاد پیربال لە شێوە هۆنراوەیەکی خۆی باسی لە (عوسمانە شەل)ی دەکرد بەیەکەم خەلیفەی عوسمانی وەسف دەکرد، د. فەرهاد شارەزایە لە مێژوو نابێت ئەم هەڵە گەورەیەی بەسەر دا تێپەڕی، عوسمانە شەل خەلیفە نەبوو سوڵتان بوو، فەترەی عوسمانی لە (عوسمان غازی ١٣٥٩-١٣٨٩) تا (١٥١٦\٩\٢٩) لە سەر دەستی سلێمان قانونی وەرچەرخا بۆ خەلافەت، نمونەی دووەم: لەو کتێبە گرنگەی (بارزانی و الحركه الكورديه)ی مسعود بارزانی کەچی ئەویش لە ڕەوتی باسی کێشەی نێوان شێخ عبدالسلام بارزانی و ئیتحادیەکان نووسیویەتی (شەڕی عوسمانی و شێخ عبدالسلام)، لە ڕاستیدا شێخ عبدالسلام نەك لەگەڵ عوسمانی شەڕی نەکردووە بەڵکو لەسەر عوسمانی شەڕی دژی ئیتحادیەکان کرد کە ئەوانە لە دوای ١٩٠٨ ئنقلابیان لەسەر عوسمانی کرد، فەترەی دوای ئەو ئنقلابە دەسەڵاتی عبدالحمید و دوای محمد رشاد و تا سوڵتان محمد واحدالدین و عبدالمجید دەسەڵاتیان نەما وەك شێوە (مەلەکی دەستوری).

بەهیوام ئەو کورتە توێژینەوەیە بۆ ئەوەبێت خوێنەری کورد بە مێژووی خۆی چەواشە نەبێت، لە داهاتوویەکی نزیك پرۆژەیەکی گەورەمان لە بارەی (بەرپرسانی مەینەتی کورد) هەیە، هەموو ئەو بابەتانە بەڵگە نامەی مێژووی ڕوون کرایتەوە.

# چەند یادەوەریەك لە گەڵ مامۆستا مەلا "محمد صادق" گرتکی

(١ – ٢)

مامۆستا عبدالله بەستۆرەیی*

ئەمرۆ کە من خەریکی نووسینم کۆتایی مانگی ڕەمەزانە، سستی پەنجەکانم و فرمێسکی چاوەکانم ناهێڵن بە ئارەزووی خۆم بنووسم، ئەوا لەبارەی مامۆستا وەك مشتێك لە خەرمانێك دەخەمە سەر کاغەز، مامۆستای ناوبراو یەکێکە لە زانا هەڵکەوتوەکانی بنەماڵەی زانای کەم وێنە " محمد ئیبن ئادەم" رحمە الله. مامۆستای هەمیشە لە یاد و لە نێو دڵان زانایکی ژیر و بەڕێوەبەربوو، هەمیشە بە زەردەخەنە و ڕووخۆش بوو، وتەکانی هەنگوینی بوو،ماڵئاوەدان و دەسکراوەبوو، لێبووردەو بە ڕەحم بوو، دڵی ماندوو و جەستەی شەکەتی تەنها بە وانە وتنەوە دەحەسایەوە، ئەو کەسێکی کەشکۆڵ ئاسابوو، هەموو زانستەکانی لە لا بوو، یادگاریەکانی بەهەشتی گەلێك زۆرن، بەڵام بەداخەوە لەبەر ئەگونجاوی بارودۆخ زۆر لە یادگاریەکانم لە بیر نەماون، یەك لە هۆکارەکانی شت لە بیرچوونەوەم ئەوەبوو کە چەند زانایکیان دیاری کرد بۆ (إجازە) بەخشین، بەڵام بەداخەوە مامۆستا لەگەڵ نەبوو، ئەگەرچی لە هەموویان زیاتر بە وانەوتنەوە و زانستەوە خەریك بوو، جارێك بۆ پشتگیری کردنی ئیجازەدانی مامۆستا، ناردیە لای مامۆستای زۆر زانا مەلا سەید محمد سەید ئیسماعیل پیرداودی.

ئەوەندەی لەبیرەوەریەکانی مامۆستام لە بیرمابن ئەمانەن:

١- لە بەرگی کتێبی باوکی ڕەحمەتیم (مەلا رسول) نووسرابوو، من کە ناوم محمد مەلا صادق گرتکی یە کتێبێکم لەم کتێبخانە کڕی بە چوار درهەم. لە کاتی فەقێیەتیم دا لە گەڵاڵە بە خزمەتی مامۆستا گەیشتم و یەکترمان ناسی، فەرمووی" (من مغنی طلاب)م لە



کتێبخانـــــەی ئێـــــوە بـــــردووە، کتێبەکەش فەوتاوە بۆت دەکڕمەوە. عـەرزم کـرد قوربـان ئـەو کتێبـەم هەیەو جەنابت کاتی خۆی کڕیوتـە و گەردەنت ئازادبێت، ئـەوکات فـەقێی زۆر هـەبوون لـە گونـدی (زێوە)بـوو. خاوەنی قەد و بـالآیەکی مامناوەنـدی و ڕێك و پێك و ڕدێنێکی پڕ و ڕەش و ڕووخسارێکی نوورانی بوو.

٢- لـە سـالّی (١٩٦٧) لـە گونـدی ئاکویـان لـە خزمـەت مامۆسـتای (قەلاتی) (مەلا عەبدوللا)م دەخوێند، کـە بـە سـەفەر گەڕامـەوە مامۆسـتا گونـــــدی زارگـــــەلّی پــــێ (موشەڕەف)بووبوو، فەقێی زۆربـوو، پێیان گوتم ئەتۆش فەقێی خۆمـانی، بینیم مامۆستا ئەوەندە سینە فراوان بوو بۆ تەعلیم چۆن فەقێی پێ حالّی دەکرا وای دەکرد، لە باسـی (حـائض مـتحیرة) بێنـووژی سـەرگەردان، بـە دانـەی بـەنتك (تەسـبح) تەسـویری دەکرد، دەیفەرموو" بـۆ نموونـە: لـە یـەکی مـانگ بـێ نوێـژبووبێ لـە شانزەی مانگ پاك بوویتەوە، چاردە ڕۆژی بۆ ماونەوە بەساغی"

دەیفـــەرموو" ئێـــرە (مەزلەقەیـــە) جێگەی پێ هەلّخلیسکانە.

٣- لـە گونـدی زارگـەلّی مزگـەوت و حـوجرە نـەبوو، مامۆستا مزگـەوتی پـێ دروسـت کـردن فێـری جومعـە وجەماعەتی کردن، بەلام لـە زەمـانی ئـەودا حـوجرە دروست نـەکرا، هـەر لەچاولێکەری گوندی زارگەلّی بوو لە چـەند گونـدێکی دیکـەی ناودەشـت مزگـــەوت دروســـتکراو فـــەقێ پەیدابوون.

## مامۆستای هەمیشە لە یاد و لە نێو دلان زانایەکی ژێر و بەڕێوەبەربوو،

**هەمیشە بە زەردەخەنە و ڕووخۆش بوو، وتەکانی هەنگوینی بوو، مالّئاوەدان و دەسکراوەبوو، لێبووردەو بە ڕەحم بوو، دلّی ماندوو و جەستەی شەکەتی تەنها بە وانە وتنەوە دەحەسایەوە، ئەو کەسێکی کەشکۆلّ ئاسابوو، هەموو زانستەکانی لەلا بوو**

٤- مامۆسـتا خـۆی و بـاوکی لـە بەرامبەر من مامێکی زۆر دلسۆز بوو، لە سالّی ١٩٧٠تووشی مالّداری بووم، ڕۆژی ژن گواسـتنەوەم مامۆسـتاو و براگـەورە و حـاجی ڕیـش سـپی بـووکێنی بـوون، مامۆسـتا چـەند گوللەیەکی تەقاند و قسـەی خۆشی بـۆ کـردین و هەنـدێ ئامۆژگـاری تایبـەتی کـردم، مامۆسـتا لـە گـەلّ هەرکەسـێك بـدوابا ئەوکەسـە واهەستی دەکرد کە لەو پەڕی ڕێز و خۆشەویسـتی دایـە لای مامۆسـتا، جارێکیان لـە خزمـەتی دا بـووم، بـە لای جوتیارێـك دا ڕۆیشـتین گوتمـان خوا قوەتـت بدات، ئـەویش وەلامـی دایـەوە، مامۆسـتا فـەرمووی" بـا منـیش کـە مێـك لێخـوڕم (جـووت بکەم) کـابراش دەستەمستەی دایە دەسـتی مامۆسـتا، بـەلام خـەتی دەســتی مامۆســتا وەك خـــەتی جووتیار ڕاست نـەبوو، جووتیارەکە زۆر بـە سـەیری چـوو لـە دەسـتی مامۆستای دەرهێنـا و گـوتی ئەمـە ئیشی تۆ نیە، مـن مەلایـەتی نـازانم، تۆش جووت نازانی!

مامۆستا فەرمووی" ڕاستە هەرکەس بە ئیشی خۆی"

٦- هەر لەزارگەڵی ڕابردین بە لای ژنێکی بە تەمەن دا، مامۆستا سڵاوی لێکرد و فەرمووی" بزنتۆکەتە کوونە، لە گەڵ بابی منداڵان کیهەتان حاکمن، بەزۆری حاکمی ماڵان بێ ڕدینە والله أعلم"

٧- هەر لەزارگەڵی جارێك لە خزمەتی مامۆستادا دابووم، دەچووین بۆ باڵەییان بۆ کردنی پرسەیەك، لە ناو لێڕی تەقەی بیوری دەهات، کەس دیارنەبوو، مامۆستاش بانگی کرد" هۆی مام تەقەتەق؟" کابرا گوتی" بەڵێ. مامۆستا گوتی: ماندوونەبی، ئینجا ڕووی لە من کرد و گوتی ئەتودەزانی ئەوها بانگی خەڵکی بکەیت، عەرزم کرد نەخێر قوربان.

٨- لە ساڵی (١٩٧٠) پایز مامۆستا گواستیەوە بۆ گوندی (ناوەند)ێ سەر بە قەزای چۆمان، ساڵی ١٩٧١من بووم بە ئیمامی زارگەڵی، بە دامەزرانی ئەهلی، بەڵام خوێندنم تەواو نەکردبوو، باسی ئیجازەمان کرد مامۆستا بە زەردە و ڕووێکی خۆشەوە فەرمووی" پێم خۆشە و خەڵکیش پێی دڵخۆش دەبێت" لەمانگی ١١چوومەوە حوجرەی مامۆستا لە گوندی ناوەند لە مانگی ٤/ ١٩٧٢مامۆستا هەموو پێداویستیەکانی ئیجازەی دابین کرد، لە بەرواری ١٩٧٢\٤\١٧ بروانامەی پێ بەخشیم بە ئاهەنگێکی گەرم و گوڕ، سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، مەسروفات لە سەر خەڵکی گوندی ناوەند بوو، خوای گەورە جەزای بە خێری مامۆستا و خەڵکی ناوەند و هەموو ناوچەکە بداتەوە، أمین. ئەوەشمان لە یاد نەچێت من یەکەم کەس بووم بۆ ئیجازە وەرگرتن لە دەمی پیرۆزی ماندوو بە دەرس و پەند و ئامۆژگاری و قسەی خێری و دەستی موبارەکی، مامۆستا لە دوای من زوو بە زوو مامۆستا مەلا عوسمان هەروتەکەونی ئیجازەی لە مامۆستا وەرگرت، پاشان کاك مەلا ئەحمەد مستەفا روستایی بوو خوالێی خۆش بێت.

**ڕۆژێکان بە لای جوتیارێك دا ڕۆیشتین گوتمان خوا قوەتت بدات، ئەویش وەڵامی دایەوە، مامۆستا فەرمووی" با منیش کە مێك لێخوڕم ( جووت بکەم ) کابراش دەستەمستەی دایە دەستی مامۆستا، بەڵام خەتی دەستی مامۆستا وەك خەتی جووتیار ڕاست نەبوو، جووتیارەکە زۆر بە سەیری چوو لە دەستی مامۆستای دەرهێنا و گوتی ئەمە ئیشی تۆ نیە، من مەلایەتی نازانم، تۆش جووت نازانی! مامۆستا فەرمووی" ڕاستە هەرکەس بە ئیشی خۆی"**

* پێش نووێژ و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی بەستۆرە. یەکەم دەرچووی حوجرەی م. محمد صادق

# مامۆستاکەم قەت لە بیرت ناکەم!

شێرزاد عدالوهاب
قوتابیەکی بە ئەمەکت

زۆرن ئەو کەسانەی کەلەگەڵیان ئەژین و ڕۆژگاری ژیانیان لەگەڵ بەسەر ئەبەین ، زۆرن ئەوانەی کە سەفەریان لەگەڵ ئەکەین، زۆرن ئەوانەی کە هامۆشۆیان ئەکەین، زۆرن ئەوانەی کە پەرستشەکانیان لەگەڵ ئەنجام ئەدەین، زۆرن ئەوانەی کە یادگاریان لەگەڵمان هەیە، بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی ئاسەواری یادگاریەکانیان جێ ئەمێنێ لەسەر ڕۆح و دڵمان.

زۆرن ئەوانەی کە بەچاو ئەیانبینین بەڵام کەمن ئەوانەی بەدڵ و ڕۆح تەماشایان ئەکەین، زۆرن ئەوانەی کە وێنەی یادگاریان لەگەڵ ئەگرین بەڵام کەمن ئەوانەی کە وێنەیان گیراوە بەڵکو هەڵکەندراوە لە ناو دڵ و ڕۆحەکاندا، یەکێك لەمانەی کە هەرگیزاو هەرگیز ناتوانم لە بیری بکەم گەر خۆشم لەبیر بکەم دڵنیام دڵ و ڕۆحم ئەو لەبیر ناکات، مامۆستای پایەداری خوالێخۆشبوو مامۆستای باوك مامۆستا محمد صادق سلمان پاکە. ئەوەی یەکجار بە خزمەتی ئەو پیاوە گەورە گەیشتبێت جەتمەن ئاساری قسە خۆشەکانی و ئاساری خۆ بەکەم زانی وە ئاساری ڕۆح سوکی ئەم پیاوە مەزنە لەبیر ناکات. جگە



لەمەی کە گۆشت و ئێسقانی ئەم زاتە هەموو علم و زانست بوو بەڵام لەبەر تەوازعی خۆی بە هیچ شێوەك دەری نەئەخست بەڵکو بە شایەدی قوتابیەکانی مامۆستای گەورەی عێراق و جیهانی ئیسلامی مامۆستا عبدالکریم ی مودەریس ئەیگوت لە دوای خۆم مامۆستا مەلا محمد صادق موفتی هەموو عێراقە بەڵام داخی گرانم چەندە ئەسەف ئەخۆم کە ئێمەی کورد پیاوە گەورەکانی خۆمان ناناسین وە قەدریان ناگرین بەڵام کاتێ مردن بۆیان ئەگرین و شینیان بۆ ئەکەین ئەمەتە هەر دووێنێ مامۆستا عبدالکریمی مودەریس چەند بەبێ ناز، چەندە بەبێ دەنگی سەری ناوە سەر خاك و ئێمەی ئێمەی بەجێ هێشت ئیمڕۆش مامۆستای باوك مامۆستا مەلا محمد صادق ماڵ ئاوایی لە هەمووان کرد .. ئای میللەتە بەدبەختەکەم .. ئای میللەتە شەر لێشواوەکەم .. ئای میللەتە خراپ حاڵی کراوەکەم .. ڕێزی کێ ئەگرن کێ لە بیر ئەکەن مراسیم بۆ کێ ئەگێڕن کێ فەرامۆش ئەکەن چلە و ساڵیادی کێ ئەکەن کێ پشت گوێ ئەخەن؟! ئەمانە هەمووی داغن لە جەرگی ئێمە ئەمانە هەمووی حەسرەتن لە دڵی ئێمە نازانم لە کێوە بۆ ئەم میللەتە ڕاست بکەینەوە سەرتاپای بەسەقەتی چێندراوە واشبزانێ خەسەن و خوسێن کچی معاویەن جاوەرە تۆ لە کێوە بۆی ڕاست ئەکەیتەوە ... هەرکاتێك دەنگێکی نورانی و پاکی بە دەستنوێژی دونیا نەویست و غەم خۆری ڕاستەقینەی خاك و وڵات و میللەت بەرز بێت ١٠٠بالو بالۆرەی بۆ ئەبەستن، بەڵام

دڵنیام ڕۆژ هەر هەڵدێت ئەم تاریکیەش ئەڕوات دڵنیام ڕۆژگارێك دێت قەدری ڕێزی مامۆستاکەم بە دیار ئەکەوێت ڕۆژگارێك دێت میللەت بزانێ گەر دووری بخەنەوە لە مێزەر سپیەکان لە دەست بە نوێژەکان ئەوا نیشانەی هەڵکەندنی گۆڕی خۆیەتی هەرکاتێك دەمی مامۆستایان بگرن بزانن دەست لە قورگی میللەت و ئازادی میللەت ئەدەن هەر کاتێك دووریان بخەنەوە لە مزگەوت و میحراب بزانن بڕانی شریانی حەیاتی ئەم میللەتە لەم میللەتە، بەڵام بۆ خۆشم نازانم شیوەن بۆ کێ بکەم نازانم نە بۆ میللەتەکەم یان بۆ مامۆستاکانم کە چەند بێ ناز جێمان دێڵن ...

خۆشەویستانم ... بابێمە سەر باسی مامۆستای گەورەم و مامۆستای باوك، ئەوەندەی لە خزمەتی بووین زۆر شتی لێ فێربووین هەندێك بە وانەو هەندێکیش بە کردار من تەنها دوو یادگاری تان بۆ ئەگێڕمەوە کە لە ناو ڕۆح و دڵم دا هەڵکێندراون.

**یەکەم:-** خوا ئەو شەرەفەی پێ بەخشیم کە لە خزمەتی مامۆستا سەفەری حج بکەم، بەڕاستی ئەمەش شوکرانەکی زۆری ئەوێ بۆ منی بێ صفەت و ئەمەك بەرامبەر خودا چونکە لەگەڵ ئەوە حەجەکە نیعمەتێکی گەورەی خوایە، هاورێیەتی مامۆستاش نیعمەتێکی تری ئەم سەفەرە بوو. بەڕێ کەوتین بۆ مەدینەی پیرۆز شاری طيبة شاری پڕ بەرەکەت و خۆشی، کاتێ دابەزین لە هوتێل دیتم حاڵەتی مامۆستام گۆڕا ... لەو مامۆستایە قسە خۆشە بۆ کەسێکی زۆر بێ دەنگ و هەست و خوست زۆر هێمن و لەسەرخۆ هەڵس و کەوتی ئەکرد بە هەستەم گوێت لە دەنگی دەبوو زۆر بێ تاقەت و مات بوو زۆرم پێ سەیر بوو! چی ڕووی داوە مامۆستاکەم ئاوا پەشۆکاوە ئەبێ نەساغ نەبێ ئەبێ عیلەتەکی نەبێ من نەزانم یان پێی نەگوتبم، ئیتر چوار ڕۆژ ماینەوە لەم شارە خۆشە بۆن خۆشە کە بۆنی پێغەمبەر و یارانی لێدێت .. بەڵێ مامۆستاکەم جوابی هیچ کەسێکی نەئەدایەوە گەر پرسیاری لێ کردبا ڕەوانەی لای مامۆستایەکی تری ئەکرد منیش زۆر بەسەرسامیەوە لێی ئەچوومە پێش دەستم ماچ ئەکرد لێم ئەڕوانی شەرمم ئەکرد لێی بپرسم مامۆستاکەم چیتە...؟ هەر ئەوەندەم ئەگوت قوربان چ کارێکت بەمن هەیە ئەیگوت دوعام بۆ بکە ... بەڵێ چوار ڕۆژان مامۆستاکەم حاڵەتی ئاوابوو تەنها ئەچووە مزگەوتەکەی پێغەمبەر نوێژەکانی دەکرد و ئەگەڕایەوە ناو جێگا کەی خۆی لێی پاڵ ئەکەوت سەیرە ئەم شارە خەڵکی بێدەنگ بەدەنگ ئەهێنێ کەسی نەزان فێرە قسە ئەکات ئەی بۆچی مامۆستاکەی من لەوپەڕی قسەخۆشی و زیرەکی ئاوا بێ دەنگ و مات بووە. لێی حاڵی نەبووم تاکو ڕۆیشتین بەرەو مەکەی پیرۆز بۆ جێ بەجێ کردنی شعائیرەکانی حەج ئا لەوێندەر مامۆستاکەم دەنگی بۆوە بێ دەنگی ڕەویەوە حاڵەتی چاك بوو خولق و خوی زۆر خۆش بوو ئازیزانم لەوێندەرێ تێگەیشتم نهێنی ئەو بێدەنگی و ماتیە چی بوو، ئەوکات تێگەیشتم مامۆستاکەم بۆ وڵامی هیچ پرسیارێکی نەدایەوە ئەوکات حاڵی بووم بۆ دەنگی بڵند ناکات. بەڵێ ئازیزانم ئەمانە هەمووی لەبەر شەرم و حەیای بوو بەرامبەر پێغەمبەری خوا – صلى الله عليه وسلم – ئەمانە هەمووی نواندی ئەوە ڕێز و حورمەت بوو بەرامبەر پێغەمبەر– صلى الله عليه وسلم.– ئای لەم شعورە ئای لەم إحساسە کە ئێمە ئەمڕۆ زۆر کەممان ئەم شعور و إحساسەمان هەیە. خودایە ئەمە چ شەرمێکە ئەمە چ ڕێزێکە ئەمە چ ئەدەبێکە ئەوانە ئەینوێنن بەرامبەر محمد مستەفا– صلى الله عليه وسلم – ئەو کات تێگەیشتم کە مامۆستاکەم عەشقی (محمد)ە – صلى الله عليه وسلم – کە مامۆستاکەم زۆر زۆر پێغەمبەری خودای خۆش ئەوێت کە بەجۆرێك

ئەدەب ئەكات دەنگی بلند بكات لە شارەكەی ئەو. یان جوابی پرسیارەكانی حاجیان بداتەوە لە خزمەتی ئەو پێەمبەرە دا یان جولەیەك بكات لە شایستەی ئەم مەقامە نەبێت بۆیە ئاوای بەسەر هاتبوو مامۆستاكەم.

ئای لە ئێمەی پێ نەگەیشتووی تێنەگەیشتوو نازانین ئەدەب بنوێنین بەرامبەر پێغەمبەری ئیسلام نازانین چۆن هەلس و كەوت بكەین لە كاتی سەردانەكانمان بۆ لای پێغەمبەر و یارانی. ئێمە هەموو ڕۆژ پێنج فەرزە سەلام لە پێغەمبەر ئەكەین بەلام نازانین ئەم سەلامانە هەمووی حەقی خۆی ئەوێت جێ بەجێ ی بكەین ئەم سەلامانە هەمووی گەیاندنی ئەوێت، چونكە كاتێك پێغەمبەری خوا جوابی سەلامان ئەداتەوە ئەوكات ئێمە حەقی دینەكەمان بدەین تبلیغاتی دینەكەمان بكەین لە غەمی دینەكەمان بژین لە غەمی میللەتەكەمان بین، ئەوكات سەلامەكان جواب ئەداتەوە بەلام ئێمەی كە كۆمەلێك حقوق و واجباتمان فەرمۆش كردووە غەمی ئەو دینەمان كردۆتە غەمێكی ئانوی ئەگەر ئیشمان نەبوو مشغول نەبووین بەهیچ ئەوكات غەمی دینەكەمان دێتەوە یاد، ئەمە چۆن پێغەمبەری خوا جوابی سەلامەكانمان ئەداتەوە.

دووەم:- لە كاتی حەج چووین بۆ بازاڕ تاكو هەندێك دیاری و خەلات بكڕین بۆ ئەوانەی دێن سەردانمان ئەكەن ... بەلام با ئەوەندەش بلێم بەڕاستی بابای حاجی سەری لێ ئەشێوێ نازانێ چی بكڕێت، چ دیاریەكی بۆ خەلك و خزمان بهێنێت ... پاشان ئەم خەلات و دیاری كڕینە ئەبێتە بار قورسی بەسەر خەرجی حاجی - زۆر حاجی هەن كەمێك پارەی هەیە بەلام لەبەر دیاری كڕین توشی قەرز داری ئەبێت جا باشترین دیاری حاجی بۆ خەلك دوعای خێر و ئاوی زەمزەم و خورمای مەدینەیە حەقە خەلك لەمە زیاتر داوای هیچیان لێ نەكەن .. جا لە خزمەت مامۆستا چووین بۆ بازاڕەكی گەورە لە پێش دوكانێكی كاتژمێر فرۆشتن وەستاین، مامۆستا ویستی هەندێك لەم كاتژمێرانە بكڕێت منیش وەكو دلسۆزیەك بۆ مامۆستام گوتم: قوربان ئەمانە كاتژمێری باش نین بۆ ماوەكی كەم خراپ ئەبن بەكەلك نایەن وام چاوەڕوان ئەكرد مامۆستاكەم دەست خۆشیم لێبكات و بلێت ئافەرین كوڕم باش بوو ئەم قسەت كرد گەرنا هەموو پارەكەمان بە هەدەر ئەچوو ... چاوەڕوانم ئەكرد مامۆستاكەم بلێت ئافەرین من نەمزانی ئەم جۆرە كاتژمێرانە خراپن بابچین ئی چاتر بكڕین ... بەلام ئەمانەی نەگوت بەلكو گوتی كوڕم! مالی خەلك مەشكێنەوە گەر كڕیت بكڕە یان ئەوەتە وازی لێ بهێنە ئەی خوا نافەرمووێت {ولا تبخسوا الناس أشیاءهم} بەلێ ئەم قسەی ووتاری مامۆستاكەم بوو، لێرەوە فێربووم كە من لە هەلەدا بووم بۆچی مالی خەلك بشكێنم بۆچی مالی خەلك لە پێش چاوی خەلك سوك بكەم. بەلێ لێرە دەرسێكی كرداری و عەمەلی فێر بووم. ئازیزان دواقسەم ئەمەیە:- **ڕۆژێك لێم پرسی مامۆستای بەڕێز چەند حەجت كردووە مامۆستاش پاش بێدەنگیەكی كەم گوتی كوڕم نازانم چەندیان خوا قبولی كردیە هەتا پێت بلێم ئەوەندە حەجم كردووە** ... ئای لەم دلسۆزیە ئای لەم إخلاصیە ئێمەش گەر كارێك بكەین پێم خۆشە هەموو خەلك دەست خۆشیمان لێبكات گەرنا تورە ئەبین و دل گران ئەبین لە خەلك چۆن دەست خۆشیمان لێ ناكەن لە كارە باشەكانمان. ئیتر سەلامی خوات لێبێت ئەی مامۆستاكەم لەو ڕۆژەی لە دایك بوویت سەلامی خوات لێبێت لەو ڕۆژەی ئێمەت بەجێ هێشت خودا لەگەل تۆ و لە خزمەت پێغەمبەر كۆمان كاتەوە لە فردەوسی بەرز امین امین.

## دووباره له مه‌لا "محمد" سه‌رگه‌ینێڵی یه‌وه

# بۆ عه‌زیزی مه‌لای ڕه‌ش له هه‌رکوێیه‌ك بێت؟

{وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ} الحج/٨

دوای ئه‌وه‌ی له گۆڤاری (چرای ڕووناکی/ژ:٢٤) دا وه‌لامێکی یه‌ك لاکه‌ره‌وه‌ی عه‌زیزی مه‌لا ڕه‌شمان دایه‌وه، به‌به‌لگه‌ی ڕۆشنی ئایه‌تی و فه‌رمووده‌ی ڕاست و به‌لگه‌ی مێژوویی و شوێنه‌واری و نامه‌ی ئاسمانی که کوردستان، یان خۆر هه‌لات (المشرق) یان میزوپۆتامیا لانه‌ی یه‌که‌م و دووه‌می سه‌رهه‌ڵدانی ژیانه، خاکی پێغه‌مبه‌ران و نامه ئاسمانیه‌کان و گۆڕانه‌کانه و کوردیش یان گۆتیش که له‌گه‌ڵ دروست بوونی یه‌که‌م مرۆڤدا چاوی به کوردستان هه‌ڵێناوه، تاکه بنچینه‌ی ڕه‌سه‌ن بووه له ڕگه‌زدا بۆ به‌رهه‌م هێنانی پێغه‌مبه‌ران و نوێ که‌ره‌وانی ئایین، جارێکی تریش عه‌زیزی مه‌لای ڕه‌ش بێ ویژدانانه و



**له (٧٠٪)ی پتری نوسینه‌که‌ی هیچ په‌یوه‌ندییه‌کی به بابه‌ته زانستی و مێژوویی یه‌که‌ی ئێمه‌وه نیه، بۆیه ئێمه هیچ ئه‌رزشی پێ ناده‌ین و به‌رکه‌ناری ده‌که‌ین**

ئالۆژیکیانه دوور له به‌هایه مرۆیی یه‌کان، جارێکی تر که‌وته‌وه بۆردومانکردنی ناوچه سنووریه‌کانی ئێمه، دوور له به‌لگه‌ی ئایینی و مێژوویی و شوێنه‌واری، پاشان تۆمه‌ت دان له ئێمه وه‌ك و ناپاك و نه‌زان و دز و ڕێگر و چه‌ته‌ی نووسین .. هتد...!

پاشان له (٧٠٪)ی پتری نووسینه‌که‌ی هیچ په‌یوه‌ندییه‌کی به بابه‌ته زانستی و مێژوویی یه‌که‌ی ئێمه‌وه نیه، بۆیه ئێمه هیچ ئه‌رزشی پێ ناده‌ین و به‌رکه‌ناری ده‌که‌ین.

مامۆستا پێ ی وایه کێ زۆر قسان بکات و جنێو بدات و تۆمه‌ت له خه‌ڵکی بدات و مه‌دحی خۆی بکات حه‌ق به‌ده‌ست ئه‌وه و گره‌وی خۆی ده‌باته‌وه. مامۆستا پێ ی وایه ئێمه ئه‌و دیالۆگه‌ی ده‌یکه‌ین وه‌کو شه‌ڕه‌به‌ندی نێوان دووبه‌ندبێژه، مامۆستا تۆ ته‌مه‌نت درێژه، زۆرت نووسیوه، به‌لام تائێستا فێر نه‌بوویت ڕێز له بیر و باوه‌ڕی خه‌ڵك

و زانایان و مەلایان بگریت، کەچی خۆت بە مەلا زادە لە قەڵەم دەدەیت!

من جنێوت پێ ناڵێم و وڵامت نادەمەوە چونکە لە ئەخلاقی مرۆڤی موسڵمان دا زمان شڕی نیە، پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: (سباب المسلم فسوق وقتالە کفر) رواە مسلم. ئێمە ڕێبازی پێغەمبەران و ئەولیایان و پیاوچاکان و زانایانمان گرتووە، مەبەستمان ڕێنوماکردنی خەڵکە لە هەموو بوارێکدا، هەرچەندە پێغەمبەران تۆمەتبار کراون بە نەزان و ساحیر و جادوکار و شێت و درۆزن و پاشان شەهید کراون، پەیامی ئەمان تەنیا ڕێنومایی بووە، لە مەیدانی بەرزەخیش دا لە خوا پاڕاونەوە: {یالیت قوم یعلمون}. من وەکو مامۆستایەکی ئایینی کە میراتگرانی پێغەمبەرانن بە ئەرکی دەزانم ئەم هەڵە مێژوویی یە گەورەیە ڕاست بکەمەوە، کە بریتیە لە ون کردنی شوناسنامەی ڕەگەزی کوردی و لە دەست کردنەوەی پیاوە گەورەکانی و ناشیرین کردنی شارستانی کەی. مامۆستا گیان: مێژوو سیمبوولی سەربەرزی و سەرنزم کردنی گەلانە، بۆیە دەست بردن بۆ لەکەدارکردنی مێژووی گەلی کورد مەترسیدارە، چونکە ڕێز و شکۆی یەك گەلە بە هەموو هۆز و تیرەکانیانەوە. پاشان

ئەو کەسەی دەیەوێ لە بارەی مێژوو شت بنووسێت دەبێ لەو ئاستە دابێت و هەڵەکان و ڕاستیەکان لێك جیابکاتەوە، خاوەن حەق بێ، بە ویژدان بێت، سینە پاك بێ، شارەزای قورئان و سونەت و نامە ئاسمانیەکان و شوێنەوار زانی و مێژوو بێت و ئایدەلۆژیایەکی ڕاستی هەبێت، چونکە ئایدەلۆژیا ڕوانینی مرۆڤ بۆ هەر مەسەلەیێك دیاری دەکات.

ئێمەی میللەتی کوردیش کە خاوەنی زمان و خاك و کلتوور و ئایینی خۆمانین، دوای ئەوەی مێژوومان شێوێندراوە پێویستە جارێکی تر دایبڕێژینەوە، چونکە لەلایەن ناحەزانی کورد و ئیسلام زۆر هەوڵدراوە ڕووی گەشی مێژوویی کورد لە کاتی نووسینەوەیدا بشێوێنرێت. بێگومان میللەتی کورد ئێستا کەوای لێهاتووە کە بێ بەش بێ لە زۆرترینی توانستەکانی خۆی، کە بریتی یە لە بڕوابوون بە شکۆداری ڕابردووی و پیاوە گەورەکانی لە پێغەمبەران لە ئادەمەوە تا خاتەم (د.خ) و پیاوە گەورەکانی تر وەکو ئال و بەیت و زانا و شۆڕشگێڕەکانی، وەکو (ابو مسلم خوراسانی) و (سەلاحەدینی ئەیوبی) و (شێخ محمود) و هتد. بێگومان هیچ گەلێکی جیهان بە دەنگی قورئان و سونەت و مێژوو

وەکو کورد خاوەنی مێژوویەکی شکۆدار و گەشاوە نیە، هەوڵی ئێمە بۆ گێڕانەوەی ئەو توانستەیە، کە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە مێژوویی یانە دەگەڕێتەوە. خوای گەورەش فەرمویەتی: {فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ} النحل/٤٣. واتا: گەر شتێ نازانن لە خەڵکی زانا بپرسن، کە ڕۆچووی زانستی ئایینی و فەلسەفی و عیرفانی و زانستین.

دەبا پێکەوە چاوێك بە مەیدانی بێ سەرەوبەرەی نووسینی مامۆستا عەزیزی مەلا ڕەشدا بگێڕین بیانخەینە سەر نەشتەری دین و زانستەوە و پوچیان بکەینەوە، هەرچەند ناڕاستی بۆخۆی پوچاوەیە (ان الباطل کان زهوقا).

١- ڕەخنە گرتن لە ناو و نیشانی سەرە بابەتەکە بێ مانایە، چونکە دەیان نووسەر ناوی کتێبەکانیان وەکو یەکە و هیچ کامیان بە دز حیساب ناکرێن، پاشان ئەو کەسانەی ئاشنان بە نووسینەکانمان دەبینن هەموو نووسینەکانمان بەڵگە دارن و بەسەرچاوە و لاپەرەوە ئاماژەیان بۆ کراوە، بەڵام ئەم سیفەتە لە نووسینەکانی مامۆستا عەزیز دا نابینرێت، ئەمەش نیشانەی لاوازی نووسینەکانی ئەوە، ئێمە

وەکو ئەو نالێین دزیارییە. پاشان تۆ خۆت بە مەلاو کوڕە مەلا ناساندووە کەچی پەنجەت بۆ هیچ ئایەت و فەرمودەیێ ڕانەکێشاوە!

پاشان ئێمە گەر ئەو ناو و نیشانەمان هەڵبژاردووە خۆمان دەزانین بۆچی ئەو ناو و نیشانەمان هەڵبژاردووە و مەبەستی خۆشی پێکاوە!

٢- مەبەستم بە (سالاچو) و (چیرۆك و ڕۆمان) بێ ڕێزی نەبووە بە پیری کە دیاردەیەکی خودایە و ڕێزمان بۆی هەیە، پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی (لیس منا لم یوقر کبیرنا). بەڵکو مەبەستمان ئەوەبووە مامۆستا لەو تەمەنەدا دەبوایە فێری ئەدەبی نووسین بوایە. پاشان مامۆستا چیرۆك و ڕۆمان نووسە نەك مەلا و زاناو لێکۆڵەری مێژوویی، وەك دەبینی لە نووسینەکانی دا لە گۆڤاری چرای ڕووناکی هەمان بۆنی چیرۆك و ڕۆمانیان لێدێت و گەر باسی مێژووی کورد دەکات وەکو نووسینی ڕۆستەم و زۆراب و ئەمیر ئەرسەلان دێتە بەر چاوت، راستە ڕووداوەکان ڕاستن بەڵام تێکەڵ بە ئەفسانەکان بوون.

بێگومان ئیمڕۆ نووسەران و قوتابیان و خوێنەران و زانایانمان کەسانی ئەکادیمی و ڕۆشنبیرن و، بێ بەڵگە ئاوڕ لە هیچ بابەت و نووسینێك نادەنەوە، پاشان دەبێ سەرچاوەکان دیاری بکرێن و لێکدانەویان بۆ بکرێت و بە تەواوی سپی بکرێن. { قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ } النمل/٦٤.

**نوسینەکانی لە گۆڤاری چرای ڕووناکی هەمان بۆنی چیرۆك و ڕۆمانی لێدێت، ئەگەر باسی مێژووی کورد دەکات وەکو نووسینی ڕۆستەم و زۆراب و ئەمیر ئەرسەلان دێتە بەر چاوت**

٣- مامۆستا دەنووسێت: (حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) وەحی لە ئوری باشووری عێراق بۆ هاتووە، بەرەوباکوری عێراق (کوردستان) دەچێت...)

یان دەنووسێت: (نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیم (د.خ) شان بەشانی میللەتی کورد ژیاون، بۆیە دەڵێن: زمانی کوردی زانیوە، کوردەکانیش زمانی ئەویان زانیوە).

یان دەنووسێت: (هەرکە ئیبراهیم (د.خ) لە فورات و ڕوباری ئوردون پەڕینەوە (عیبری) بەدوا دەکەوێ، ئەم ووشەیە لە (عبر) ەی عەرەبی وەرگیراوە واتا: پەڕینەوە).

دەنووسێت: (عەرەب و کەنعان و نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم کە ئیسرائیل و قورەیش دەگرێتەوە لە سامی کوڕی نوحن، کورد و فارس و هیند و ئەوروپی یەکان لە (یافیس)ن، حام باپیرەی ڕەش پێستەکانە). کوان سەرچاوەکانت؟!!!.

وە دەنووسێت: (زمانی عەرەبی و کوردی لە زمانی سامی یەوە هاتوونە، هەردوو زمان لە یەکەوە نزیکن و ڕیمانیان یەکە). بە کورتی مامۆستا پێ ی وایە ئیبراهیم عیبری

بووه نەك كورد، هاورده بووه نەك خەڵكی كوردستان. لێره مامۆستا خۆی خستۆته گێژاوێكی پڕ لە نەزانیەوه گەر خودا فریای نەكەوێت بێگومان خنكاوه، چونكه:

(١) بەدەقی قورئان ئیبراهیم عیبری نەبووه، نە ئاسووری {مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا} ال عمران/٦٧. مامۆستای بەڕێز لێرەدا مەبەست لە زمانە، نەك ئایین، نەسابەكانی عیبری و ئاسوری هەوڵیان داوه پێغەمبەران بكەنە موڵكی خۆیان، وەكو چۆن عەرەب و فارس ئەو هەوڵەیان داوه و لە نووسینەكانیاندا دەیانخوێنینەوه. گەر مەبەست لەم ئایەته ئایین بوایە، ئەوا بێگومان ئایینەكان یەك ئایینن، قورئان لە بارەی قورئان دەفەرموێ: {إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ، صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ} الاعلی /١٨-١٩. واتا: قورئان بەشێكه لە پەراوەكانی رابردوو، پەراوی ئیبراهیم و موسا.

(٢) بە دەقی تەورات ئیبراهیم لە دۆڵ ناران لە دایك بووه نەك لە (ئەور)، بروانە: (قصص الانبیاء/ عبدالوهاب النجار/ استاذ التأريخ الاسلامي بكلية الاصول الدين/ دار الحديث/ القاهرة ل: (١٠٦): (انه فتى من أهل فدان ارام بالعراق كما في التوراة). واتا: وەكو لە تەوراتدا هاتووه ئەو خەڵكی دۆڵنارانه.

بروانە: (ل: ١١٠) لەوێ دا هاتووه: (رحلتة الى اور الكلدانين ثم حران). واتا: گەشتی ئەو بۆ ئوری كلدانیەكان پاشان بۆ حەران. بەو پێیه مامۆستا گیان ئیبراهیم كوڕی كوردستانه لە وێوه گەشتی كردووه بۆ ئوری كلدانیەكان و پاشان بۆ حەران چووه، نەك به پێچەوانەوه.

٣- پاشان مامۆستای بەڕێز وەكو لە كتێبی (مهد الحضارة/ الحياة في شرق كردستان/ دبليو اي ديطرام/ ل: ٢٣/ت: جرجيس عبدالله) دا هاتووه: (موسڵمانان بروایان وایە بەتەواوی ئورفە بریتی یە لە (ئەوری كلدانیەكان).

٤- كوردەكان بەر لە ئیسلام حەجی كەعبەیان كردووه، چونكه ئیبراهیمیان بە باپیرەی گەورەی خۆیان زانیوه، بروانە (مووج الذهب/ المسعودی/ ج١/ل:٢٢٠/ دار المعرفة/ بيروت/ ٢٠٠٥م) (پێشینەی فارسەكان چونكه حەج و تەوافی كەعبەیان كردووه وەكو رێزێ بۆ كەعبە و باپیرەیان ئیبراهیم و دەست گرتن بە رێنومای ئەو و نەسەبیان، دواكەسیان كە حەجی كردووه (ساسان) كوڕی (بابك) بووه باپیرەی (ئەردەشێری كوڕی بابك).

پاشان مامۆستای بەڕێز بروانە (تأريخ الطبري/٢/٨١٧) و (الكامل في التأريخ/١/١٣٣) لە نامەكەی دوا پادشای دەوڵەتی (الفرثية) دا هاتووه: كە بۆ ئەردە شێری كوڕی بابكانی دەنێرێ هاتووه: (ايهاالكردي المربي في خيام الاكراد). بەو پێیەی ساسانیەكان كوردبوون نەك فارس. لێره دا دەبینی گەلی كورد تێكەڵ بە گەلی فارس كراوه، چونكه هەندێ نووسەر پێیان وایە كوردەكان تیرەیەكن لە فارسەكان وەكو (ابوالفدا الايوبي) ٧ (المختصر في الاحنبار البشر/ ج/١/ل:٨٣) دا ئاماژەی پێ داوه.

٥- بەدەقی (صحيح المسلم) كوردەكان كوڕانی ئیسحاقن و یەكێ لە باپیرەكانیان ئەوه: (لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بني اسحاق) واتا: قیامەت نایەت تا حەفتا هەزار كەس لە كوڕانی ئیسحاق قوستەنتینی یە نەگرن. (شيخ العلامة: منصور علی ناصف) لە (التاج الجامع للاصول/ ج/٥/ل:٣٢٩) دا هاتووه: (اي من اكراد الشام المسلمين). كەواتە: ئیبراهم باوكی كوردەكانه.

پاشان فەرمودەی تر رونی دەكاتەوه ئەم كوڕانی ئیسحاقه ئاڵا رەشه كوردەكانن، لە خۆرهەڵات دێن بەغدا و ئەستەنبۆڵ و ئێران و سوریا دەگرن و ئیسرائیل دەشكێنن و

یارمەتی دەری مەهدی و مەسیح دەبن (علیهماالسلام)، مێژووش خۆی دووباره دەکاتەوە: (نعیم بن حماد) له (الفتن) دا (ل:١٧/فەرمودة:٥٧٢) دا گێڕاویەوه: (انما اولئك قوم يأتون من المشرق حردين معهم رايات سود... شعارهم اقتل اقتل يعني بكوش بكوش). (الحاج الشيخ محمد مهدي زين العابدين النجفي) له کتێبی (بيان الائمة للوقائع الغريبة و اسرار العجيبة/ج١/ل: ٢٧٩) دا له پێشەوا عەلی (كرم الله وجهه) گێڕاویەوه: (وارتفع علم على العماليق في كردستان و قال امير المؤمنين - ع- ويل للبغداديين من سيوف الاكراد). واتا: ئالأی گەوره پیاوانی کورد بەرز کرایەوه: هاوار بۆ بەغدادیەکان لەبەر زەبری شمشێری کوردان. قورئانی پیرۆز لەبارەی سیسۆلۆجیای کورد و ڕۆڵی داهاتوی دەفەرموێ: {قُل لِّلۡمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ سَتُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٍ شَدِيدٍ}. الفتح/١٦

له (تفسير ابن كثير) له (ابو هريره) گێڕاویەوه (ج٤/ل: ٢٤٣) (هم البارزون) واتا: ئەوگەله ئازایه له له باریزەکانن که جەنگی عەرەب دەکەن. باریزەکان کێن: ئەبو هورەیره دەڵێ: کەسه حاجی یەکه مەبەست له فەرمودەیە: (تقاتلوا قوما نعالهم الشعر: هم البارزون يعنى الاكراد). واتا: لەگەڵی دەجەنگن کاڵه به مون: ئەوانه باریزەکانن واتا: کوردەکان.

له سورەتی الاسراء (٤-٧) دا ئاماژه بەم گەله ئازایه که دووجار حوکمی جیهان دەکات: {وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا * فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ......}

عەللامە (القرطبي) له (التذكرة) دا (ل:٥٥٢) له حوزەیفەوه له پێغەمبەری (د.خ) گێڕاوەتەوه: (ان بني اسرائيل لما عصوا و قتلوا الانبياء سلط الله عليهم غبت نصر فهو من المجوس، فكان ملكه سبعمأة سنة، و هو قول تعالى: {فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ}.

لێره دا پێغەمبەر (د.خ) ئەم گەلەی یەکەم جار دەشکێنێ و ئەم ئایەتەی پێ تەفسیر دەکات نەبو خزنەسر، که یەکێکه له مەجوسەکان. ئاشکرایه مەجوسەکان کوردەکانن، که پەیڕەوانی زەردەشت پێغەمبەر بوون.

مەسعود محمد له (لسان كرد/ل:١٩) دا ئاماژه دەکات (مجوس) له موغەوه هاتووه یان موگ که پەیڕەوانی زەردەشتن، زەردەشت کوڕی دەغدوڤای کچی ئیبراهیم خەلیل بووه وەکو له کتێبی (زەردەشت و زەردەشتیەکان) دا ڕونمان کردۆتەوه. دیسان (قرطبي) ئاماژەی کردووه جارەکی تر له ئیسرائیل باڵادەست تر دەبێتەوه: (لو لم يبق من الدنيا الا يوم لطوله عز وجل حتى يملك رجل من اهل بيتي جبل الديلم و القسطنطينية). اسناده صحيح/ابن ماجة. واتا: گەر قیامەت ڕۆژێکی مابێ خوای گەوره پیاوێکی له پشتی من دەنێرێ که (مەهدییه) چیای دیلم و ئەستەنبول دەگرێت. بەوپێیه جەنگی تورك و هەر مجدون ئاڵا ڕەشەکان ئەنجامی دەدەن.

٦- پاشان مامۆستای بەڕێز وەکو مێژوونوسی گەورەی کورد که هەرگیز نه تۆ و هیچ مێژوونوسێکی تری میللەتی کورد تۆزی له دوو ناکات (ئیحسان نوری) له کتێبی

(مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد/ و:حەمە کەریم عبدالله) /چ١/ل: ٩٠) دا دەنووسێت: (نەمرود و ئازەر وشەگەلێکی ئارین). (ناوی خێزانەکەی ئیبراهیم سارە بووە، ساریش لە زمانی کوردیدا واتا: سارد). دەنووسێ: لە (قاموسی



کتاب المقدس) دا هاتووە لە تەوراتەوە دەنووسێ: (ئیسماعیلی یەکان لە میدییەکان بوونە، میدیەکانیش دەچنەوە سەر قەتوری ژنی ئیبراهیم).

دیارە وەکو (مینورسکی) باسی کردووە و مەسعود محمد (لسان کرد) ئاماژەی کردووە لە (ل:١٩) دا: میدیەکان باپیرەی کوردان بوون).

٧- پاشان مامۆستای بەڕێز سەرنجت ڕادەکێشین بۆ یەکێ لە ڕەخنەکانی تر کە وتوتە: (نوح کوڕی کوردستان نەبووە بەڵکو دوای لافاو لەوێ لەسەر جودی نیشتەجێ بووە).

مامۆستا بڕوانە کتێبی (معجزة القران و الطوفان/ المهندس سعد حاتم محمد مزرة/ط١/ ١٩٩٥/ بغداد/ل:٩٤) لەوێدا هاتووە: بەپێی نووسراوەکانی تابلۆی گلگامش لە بەندی (١١) دا نوح بە (نوحی بابلی) هاتووە.

پاشان مامۆستا گیان سەرنجت ڕادەکێشم بۆ کتێبی (الانسان وقواة



الحفية/ كولن ولسن/ ل:١٠١/ مطبعة رشاد/ بغداد/١٩٨٨) لەوێدا هاتووە: ئەم تابلۆیانەی گلگامش لە ئەینەوا دۆزرانەوە، کە بەشێ بوون لە کتێبخانەی سنعاریب.

ئەزانی مامۆستا بابل کوێیە؟ بڕوانە کتاب المقدس/ سفر التكوين/١٠/١١): (وقد تكونت مملكته اول الا مومن بابل وا كدوكلنه فى ارج – (Shinay) بەوپێیە وەکو (ئیحسان نوریش) -د- فەرمویەتی بابل سنجارە یان شەنگال لای ئەینەوا لە قورئانیش دا لە سورەتی (البقره/١٠٢) { وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ } ئاماژەی بە بابل و شارستانی ئەوێ کراوە.

پاشان مامۆستا بڕوانە (تفسير در المنثور/ للسيوطي/ ج٣/ل: ٤٣٢) لەوێدا هاتووە: (ابن ابى حاتم) و (ابن عساكر) لە (قتادە) گێڕاویانەوە: (ان نوحا بعث من الجزيرة). واتا: نوح لە جەزیرە هاتووە، واتا: (جەزیرەی



ئیبن عومەر) کە هەمان ناوچەی موسڵ و چیای جودییە.

٨- مامۆستا گیان سەرنجت بۆ ئەو سێ تابلۆ دێرینانە ڕادەکێشم کە ئینگلیز لە ساڵی (١٩٢٠) دا لە کوردستان دۆزینیەوە و لە (هاید

پارك) دا بلاوکرانەوە و دوای ئەوەی دەگاتە دەستی شوێنەوارزانی ناودار (تقی عابد) دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەم وشانە دەتوانێ هەڵیان بێنێ

## پێغەمبەری ئێمە (د.خ) زمانی کوردی زانیوە و جلی کوردیشی لەبەر کردووە: لە کتێبی (بدائع اللغه/ فصل الدال المهمله/ ل:١٨٠) نووسینی (علی اکبری) دا هاتووە

و لە سێ پەڕاوی گەورەی ڕۆژنامەی (العـــــرب/٢٨-٢٩-٣٠/ ١٩٩٠) دا بلاویان بکاتەوە و لە وێدا بنووسێت وەك لەم (٣) وێنەیەدا دەبینین:

(١) باخچەی ئادەم (الجنه) لە (دار السلام) بووە لە ڕواندز.

(٢) (نوح) ناوی کوردە بووە واتا: کوڕی دەیەمی ئادەم.

(٣) ئیبراهیم نەوەی نوح ناوی (سەفا) بووە، لە هۆزی جاف بووە خێزانەکەی هەورامی بووە، بۆیە دەگوترێ سەفاومەڕوە.

(٤) ئێستا لە کەڵێساکانی ئەمریکا بە ئاشکرا لە ویردەکانیاندا هاتووە، کە دوا ڕاسپاردەی مەسیح بەکوردی ئەوەبووە: (لاهی لاهیی سەیرکە چی بەمن دەکەن، لاهی لاهی سەیرکە چی بەمن دەکەن). ئێستا ئەم تابلۆیانە لە مۆزەخانەی بەریتانیا هەڵگیراون.

٩- مامۆستا گیان بە دەقی قورئان هەموو پێغەمبەران لە نەژادی نوح و ئیبراهیمن: { إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ *ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ }ال عمران/٣٣-٣٤.

پاشان کاتێ ئیبراهیم کوردستان بەجێ دێلێ جێگا بە زەردەشت دەدات بە دوای خۆیدا و ئاوێستا بە زمانی کوردی دێت. کاتێ دەڕواتە ولاتی شام ئیسحاق لەوێ بەجێ دێلێ نامە ئاسمانیەکان بە زمانی خەڵکی ئەوێ دێ کە عیبری و زمانی تر بووە، کاتێ دەڕواتە حیجاز ئیسماعیل لەوێ بەجێ دێلێ و ئەوێ ئاوەدا ن دەکاتەوە و خێڵە عەرەبەکان دەوری لێ دەدەن و لەوان زمانی عەرەبی فێر دەبێت وەکو لە (صحیح البخاری) دا هاتووە: (ثم شب فیهم وتعلم لغة العربیة منهم) واتا: لە ناو عەرەبدا گەورە بوو زمانی عەرەبی لەوان فێر بوو. واتا: کوڕانی ئیبراهیم بۆ سەر هەرگەلێ چووبن بەزمانی ئەو گەلە سروشیان بۆ هاتووە و هەموو زمانێکیشیان زانیوە، بەلام خۆیان خەڵکی کوردستان بوون و نەژاد ئیبراهیمی کوردی بوون. بۆ نمونە: پێغەمبەری ئێمە (د.خ) زمانی کوردی زانیوە و جلی کوردیشی لەبەر کردووە: لە کتێبی (بدائع اللغه/ فصل الدال المهمله/ ل:١٨٠) نووسینی (علي اکبري) دا هاتووە، وەکو لە (پەیامی زانایان /٥/ ٢٠٠٢) دا بلاوکرایەوە و مامۆستا (عبدالله زەنگنە) بە دیاری پێیدام و سوپاسی دەکەم: (ڕۆژێ حەزرەتی فاتیمە -س- لە پێغەمبەری باوکی (د.خ) دەپرسێ: ئایا زمانی غەیرە عەرەبی هەیە؟ پێەمبەر (د.خ) فەرموی: بەلێ زۆرن وەکو زمانی کوردی. حەزرەتی فاتیمە سەری سوڕما ئاخۆ دەبێ کوردی چ زمانێك بێ، لەوکاتەدا یەکێ لە دەرگاکەیدا

فاتیمه چوو کردییەوە و سەیری کرد پیاوێکە وتی: (میمکە زەحمەت نەبێ مەمەد لە ماڵە)؟ حەزرەتی فاتیمە وتی: قوربان کابرایەکە دەڵێ: میمکە مەمەد لە ماڵە؟ حەزرەت فەرموی: ئەوە زمانی کوردییە ئەوەش جبریلە بڕۆبڵێ: مەمەد لە ماڵە).

لە (عون المعبود/ شرح سنن ابي داود/ج٣/ل:١٠٣) دا (فەرمودەی: ٩١١) دا هاتووە لە (عائیشە) وە: (واخذ كرديا كان لابي جهم، فقيل يارسول الله الخميصة كانت خير من الكردي). واتا: جلی کوردی وەرگرت کە هی (ابی جهم) بووە، نەفەرێ وتی: ئەم پۆشاکە لەم جلە کوردیە باشترە بیکە بەرت. زانای گەورە (محمد افندی الكردی) دەڵێ: ئەمە کورد کوڕی کەنعان کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوحە، ئەوانە زۆر هۆزیان لێ دەبێتەوە: (سۆران و گۆران و کلهور و لوڕ).

کەواتە: مامۆستای بەڕێز نوح خۆی کورد بووە و نامەکەی بە کوردی هاتووە، ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیادا پارێزراوە، گەر (سام و حام و یافث) باوکی گەلانی ترین ئەمە هیچ لەکوردایەتی نوح ناگۆڕێ، ئەوکاتە کورد دەبێتە بنچینە و ڕەگەزەکانی تر دەبن بە لق، نەك بە پێچەوانەوە، بگوترێ کورد نەوەی جنۆکەیە وەکو لە لە میتۆ لۆجیاکان

**ڕۆژێ حەزرەتی فاتیمە – س- لە پێغەمبەری باوکی (د.خ) دەپرسێ: ئایا زمانی غەیرە عەرەبی هەیە؟ پێەمبەر (د.خ) فەرموی: بەڵێ زۆرن وەکو زمانی کوردی، حەزرەتی فاتیمە سەری سوڕما ئاخۆ دەبێ کوردی چ زمانێك بێ، لەوکاتەدا یەکێ لە دەرگاکەیدا فاتیمە چوو کردییەوە و سەیری کرد پیاوێکە وتی: (میمکە زەحمەت نەبێ مەمەد لە ماڵە)؟ حەزروتی فاتیمە وتی: قوربان کابرایەکە دەڵێ: میمکە مەمەد لە ماڵە؟ حەزرەت فەرموی: ئەوە زمانی کوردیە ئەوەش جبریلە بڕۆبڵێ: مەمەد لە ماڵە**

دا هاتووە، وەکو لە (حوج اند هبا) دا ئاماژەی بۆ کراوە، یان کورد لە ڕەگەزی عەرەب پەیدا بوبێ وەکو (ابن كلبی) دەڵێ: کورد لە نەوەی (کورد کوڕی عەمرۆی کوڕی مزیقیایە). یان فارس دەڵێ: لقێکە لە خۆمان وەکو (لسان العرب) دا(ابن اعرابی) دەڵێ: لعمرك ما كرد من ابناء فارس ولكنه كرد بن عمرو بن عامر). (الكرد و كردستان/ د.فرست مرعی/ ل:٦–٢١). سەیر بکە. کەواتە: کورد لە ڕەگەزی هیند و ئەورووپیش نیە، ئەو بنچینەیە و ئەوان کە لە گەلی ئارین لقێکن لە کورد.

١٠- {وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ} هود/٤٤ مامۆستای بەڕێز وشەی (جودی) و گوتی و کوردی لە یەك ڕەگەوە هاتون. (ارشاك سافر ستيان) لە کتێبی (الكرد وكردستان/ت: د.خليل احمد محمود خليل/ل:٣٠) دا ئاماژە دەکات: (وشەی کورد لە ناوچەی گۆتیۆم – Gutium) و گەلی گۆتی (جوتيوم) وەرگێراوە.

١١- مامۆستای بەڕێز لە کتێبی (الكرد في مصادر القديمة/ج١٠ درايظر) دا (ت: فواد حمه خورشيد) دا (ل:٣٥) دا هاتووە: (هەندێ لە نووسراوانی کەڵێسە جیهان لە نێوان کورانی حوحدا دابەش دەکەن: ناوچەی کوردەکان (کاردوئێن)

دەدەن بەسام، کەچی لە تەلمودا هاتووە: (ئیبراهیم حەوت ساڵ لە خاکی کوردا دەمێنێتەوە). مامۆستا گیان دابەشکردنی جیهان لەوانە کوردستان بەسەر سام دا و لە هەمان کاتیش دا، سام باوکی عیبر و عەرەب بێ کەوتە: کوردستان دەبێ بە خری تەسلیم بەوان بکەین و بڵێین: ئێمە نامۆین لە کوردستان و کوردستان خاکی سامیەکانە. (تقي عابد) زۆر جوانی پێکاوە، کە داهێنی سام دەستی جولەکە پەیدای کردووە بۆ داگیرکردنی گەلان و خۆرزگارکردن لە لە ژێر دەستەیی. مامۆستا تۆ من تاوانبار دەکەی بە دەست ڕاکێشانی جولەکە بۆ ناو کوردستان، چونکە ئیبراهیم بە کورد دەزانم و عیبریش گەلی ئیبراهیمن، بەڵام مامۆستا گیان تۆ ئەم هەڵەیە دەکەی کاتێ ئیبراهیم بە عیبری دەزانی و هەموو عیبریەکانیش بە کوڕی ئیبراهیم دەزانیت. لە هەمان کاتیش دا لە ژمارەی ڕابردوی گۆڤاری چرای ڕووناکی ژمارە(٢٤) ئاگادارمان کردبویەوە کە بەسەرهاتی (عبر) دروستکراوی نەسابەی عەرەب (هشام بن محمد بن سائب الكلبية) لە (طبقات ابن سعد) دا (ج١/ل:٦٢) هاتووە: کاتێ ئیبراهیم بەسەر فوراتدا پەڕییەوە زمانی گۆڕی بە عیبری واتە: (عبر) واتە: پەڕینەوە. بروانە: (میزان الاعتدال) ی (الذهبي/ج٥/ل:٦٠) لەوێ دا هاتووە: (احمد) و (الدار قطني) و (بلاذري) بە درۆزنی دەزانن. کەچی مامۆستا تۆ شوێنی ڕای ئەم درۆزنە کەوتوویت بۆ سەلماندنی بۆچونە لاوازەکانی خۆت! بەڵام چی بکەم لە (علم الحديث) ئاگادار نیت.

لە کۆتایی دا بە پێچەوانەی قسەکانی تۆ دەڵێم:

چۆن دەزانم ئاسمان لە حەوامانە و حەوجێ بە پەنجە و چاوتێ بڕین ناکات ئاواش دەزانم حەزرەتی ئیبراهیم و وەچەکانی کوردی کوڕی نوحی کوردن، نە عیبرین و نە عەرەب و نە هیچ ڕەگەزێکی تر. داهاتوش بە ناچارییەوە دەبێ کورد ئەوە قبوڵ بکات و لەبەرنامەی خوێندندا بچەسپێنێ و ببێ بە واقیعێك و شوناسنامەی گەلی کورد دیاری بکات. پاشان قورئان فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا ﴾. مامۆستا گیان کورد نەبە جولەکە و نەبە فارس و نە ئەمریکا و نەبە عەرەب و تورك ڕزگار ناکرێن و ئەوان داگیر کەرن و هەرگیز حەز بە ڕزگاری ئێمە ناکەن، ئەوانەی ڕزگاری گەورە بۆ کورد دێنن ئاڵا ڕەشەکانن وەکو باسکرا کە کوردەکانن و پێری مەهدی و مەسیحن لە داهاتودا.

دواجار سەرنجت بۆ ئەم چەند فەرمودەیە ڕادەکێشم و بیان خوێنەوە تا زیاتر تێ بگەیت و بەبۆچونەکانتدا بچیەوە و لێیان پەشیمان ببیەوە و خۆت لەو نەزانی و گێژاوە ڕزگار بکەیت کە تێ ی کەوتویت، وەکو خۆت دانت بەوە دا ناوە تۆ ناتوانی ملبە ملانەی من بکەیت، من هیچ نیم بەڵام حەق بەدەستمنەوەیە، ناحەقیش ملبەملانەی تاسەری حەقی پێ ناکرێت دەبێ چۆك دابدات هیوادارم خوا ڕێنومان بکات:

- (تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم، فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدي) رواه ابن ماجة و صححه الحاكم و ابن كثير.
- (يجيء عيسى ابن مريم من المشرق فيقتل الدجال). رواه الطبراني في معجم الكبير.

وریابە مامۆستا گیان مهدی و مەسیح لەوەچەی ئیبراهیمن ئەوان ڕزگاری بۆ کوردستان و جیهان دێنن، لە کۆتایی دا دەڵێین: {ربنا آمنا بما انزلت واتبعنا الرسول فاكتبنا مع الشاهدين}.

# بانك BANK

د.احمد باليساني

لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا بانك نەبووە ، لەجیاتی بانك ( بيت المال ) واتە خانووی ماڵ كە گەنجینەی دەرلەت بووە هەموو جۆرە ماڵێكی بەردەستی حكومەتی تیادا پاراستراوەو لە لایەنەكانی پێویست و دیاركراو بەگوێرەی شەرع سەرپەرشتی كراوەو موچەی لێ دراوەو دابەش یا خەرج كراوە لە بەرژەوەندی گشتی و تایبەتی. خەڵكانیش پارەو پولی خۆیان هەر بەخۆیان هەڵیانگرتووەو پاراستویانە نەبیستراوە لەجێگایەكی تایبەتی وەك بانك دانرابێ و هەلگیرابێ .

وشەی بانك ووشەیەكی ئیتالیە لەوەوە هاتووە كە ئەوانەی كاری پارە گۆڕینەوەیان لە سەر ڕۆخی دەریادا كردووە مێزێكیان لە پێشەخۆیانە داناوەو جۆراو جۆری پارەیان لەسەر داناوە بۆ ئەم كارەو پێ وتراوە ( banko بانكو ) [1]، لەدواییدا وای لێهاتووە ئەم جۆرە كەسانە بوینە جێی متمانە پێكردن و خەڵكان پارەیان لا داناوون بۆ پاراستنی بەرامبەر بەكرێیەكی كەم ، لەدواییدا



بینیان خەڵكان پارەكانیان زوو وەرناگرنەوە بەتایبەتی ئەوانەی بەسەفەر ئەچن ، خەڵكی تر هەبوو داوای قەرزیان لێ ئەكردن ، بیریان كردەوە كە ئەم پارەیەی خاوەنەكەی زوو نایەوێتەوە بەقەرز بیدەنە یەكێكی ترو سووی لەسەر وەربگرن ، بەرەبەرە كە بینیان سوودی زۆرە وای لێهیات داوایان لەخەڵك ئەكرد كەپارەیان لادابنێن سوویان بدەنێ و دووبارە بەسووی پتر بدەنەوە قەرزی داواكراوو قازانجی لێ بكەن ، ئەم كارە گەشەی پێ دراو وای لێهات چەند كەسانێك ببنە هاوبەش و دەزگا دروست بكەن بەشێوەی كۆمپانیای ئەهلی ولە ولاتانا بڵاو بێتەوە ، بەڵام زۆر جار وای لێ ئەهات داواكردنی قەرزو كێشانەوەی دانراوەكان پتر بێ لە كۆی گشت

## گۆڕینەوەی جۆرێکی پارە بە جۆرێکی تر وەك دۆلار بە دینار کەپێی ئەڵێن (صرف) ئەمەیان بە مەرجەکانی شەرعی دروستە کە ئەبێ دەست بەدەست بێ و هیچ کامیان گیر نەبێ و ماوەی بەسەردا نەڕوات

داگراوو پاشەکەوت کراوەکان کە ئەبوە هۆی کێشەی ئیفلاس بوونی زۆر لە بانکەکان ، بۆیە بیریان کردەوە کە حکومەت بەم کارە هەڵسێ و ئیتر لە سالی ١٥٨٧م یەکەم بانکی حکومی دامەزرا لەدواییدا ئەم سیستەمە بڵاو بووەوە لە ولاتانی تر[٢] .ئیستاش هەردوو جۆری هەیە واتە بانکی حکومی و بانکی ئەهلی .

بەم جۆرە ئەبینین کە بانك دەزگاو سیستەمێکە لە ژینگەی سەرمایەداریدا لەسەر بنەمای ڕیبا دامەزراوە بە بێ ڕەچاوکردن و ئاگاداری ڕێنمایەکانی ئایینی و ڕەووشتی مرۆڤایەتی . بۆیە زۆربەی کارەکانی نا شەرعییەو پێچەوانەی حوکمەکانی ئیسلامە .

**کارەکانی سەرەکی بانك[٣]:**

کارەکانی سەرەکی بانك بە کوورتی بەم جۆرەیە تۆماریان ئەکەین و هەر کارە حوکمەکەشی لەگەڵ دیار ئەکەین :

١ـ وەر گرتنی دانانی پارە بۆ ماوەیەك کە نابی زووتر لەو ماوەیە وەری بگرێتەوە لەگەڵ ئەوەشا سووی لەسەر وەرئەگیرێ .ئەمەیان حەڕامە چونکە ڕیبایە .

٢ـ پارە بە قەرزدان بەرامبەر بە سووی پتر لەوەی کە ئەیدا . ئەمەشیان لای گشت کەس ئاشکرایە کە حەڕامە .

٣. پارە بەقەرز وەرگرتن بەرامبەر بە سووی کەمتر لەوەی کە وەری ئەگرێ .ئەمەش هەر وەکو هی پێشوی ئاشکرایە کە حەڕامە .

٤ ـ وەرگرتنی دانانی پارە لە ( حیسابی جاری ) بە بێ سوو هەرکاتێ ویستی وەری ئەگرێتەوە . ئەمەیان حەلالە .بەڵام لەوکاتی کە لایان ئەمێنێتەوە بەکاری دێنن بۆ کاری ڕیباو ئەبێتە یارمەتی دانی ڕیباکاری .

٥ ـ گۆڕینەوەی جۆرێکی پارە بە جۆرێکی تر وەك دۆلار بە دینار کەپێی ئەڵێن (صرف) ئەمەیان بە مەرجەکانی شەرعی دروستە کە ئەبێ دەست بەدەست بێ و هیچ کامیان گیر نەبێ و ماوەی بەسەردا نەڕوات .

٦ ـ ناردنی پارەی بازرگانەکان لەوڵاتێکا بۆ وڵاتێکی تر بۆ بازرگانی واتە کڕین و هاوردنی کاڵا لە دەرەوە بۆ ژوورەوەی وڵات بەرێی کردنەوەی موستەنەداتی متمانە، ئەمەش دروستە ئەگەر پارەی بازرگانەکان بێ و کرێی ناردنی لەسەر وەربگرن، بەڵام هەندێ جار پارەی بازرگانەکە بەش ناکات و بانك بۆی تەواو ئەکات بەقەرزی پەیوەست بە سوو ئەمە دروست نیەو حەڕامە .

٧ ـ هەڵگرتن و پاراستنی شتی بە نرخ بەرامبەر بە کرێ. دروستە چونکە کرێیەکە بەرامبەر کاری پاراستنە .

٨ ـ دروست کردنی پەڕی مالی( الأوراق المالیة ) .وەك: کومپیالەو سەنەدات .

٩ ـ فرۆشتنی سەهم و سەنەداتی مالی .هەردووکیان دروست نیە چونکە ڕیبای تیادایەو ناشەرعیە .

لێرەدا ئەبینین زۆربەی کارەکانی بانك لە سەر قەرزی بە سوو (ربا) دامەزراوەو سووش لە شریعەتی ئیسلامیدا وەك لەپێشدا دەرکەوت زۆر حەرامەو بە گوناهی گەورە ئەژمێردری. تەنیا ئەو کارانەی حەلاڵە کە کرێی لەسەر وەرئەگیرێ لەجیاتی پێهەڵسانی بەکارێکی خزمەت گوزاری بە سوود بۆ مرۆڤ بەڵام ئەویش هەر تۆزی ڕیبای لێ ئەنیشێ.

**بانکی ئیسلامی :**

لەبەر ئەوەی بانکی سەرمایەداری کە لە ولاتانی بێگانە بۆمان هاتووەو کارە سەرەکیەکانی حەرامە زۆر لە زانایانی ئیسلامی ئەم سەردەمە بیریان کردەوە کە بانکی ئیسلامی دابمەزرێنن لەسەر بنەمای حەلال هەتا موسڵمانان توشی ڕیبا نەبن و بتوانن بەرژەوەندیەکانی مالی خۆیان ببەنەسەر بەبێ کێشەی ڕیبا. بە شێوەیەکی وا هەرمامەلەیەکی ڕیبای تیابێ بیکەنە بازرگانی وەك یەکێك بیەوێ قەرز وەربگرێ بۆ کرینی ئوتومبێلێك ، بانك لەجیاتی قەرزی بداتێ سووی لەسەر وەرگرێ ئەتومبێلەکە ئەکرێ بۆ خۆی و بە قەرز ئەیفرۆشێتەوە کەسەکەو قازانجی لێ ئەکات . یا بیکەنە بە کرێدانیکی وا کۆتایی بێت بە کردنە سامان ، وەك بانك خانوێك بکرێ بیداتە کەسێك بەکرێ بۆ ماوەیەکی وا تا نرخی خانوەکە بە قازانجەوە دەستکەوتی بانك ئەبێتەوە ئەوجا بەناوی بکرێ . هەروەکو فرۆشتنی بەقیست ئە توانێ بەناو کردنەکە پێش بخات ئەگەر پارەکە بەخێراییتر پێش کاتی خۆی تەواو بکا .هەروەها پارمەتیدانی بازرگانەکان بە پێدانی متمانەی دەرەوە بۆ هاوردنی کالا بەرێی بازرگانی هاوبەشی . هەڵسان بە کرین و فرۆشتن بەو پارەی لە لایان دانراوە مەبەستی قازانجو دابەش کردنی بەسەر خاوەنەکانی پارەی دانراو . جا بۆ ئەم مەبەستە خەڵکان بانکەکە ئەکەنە وەکیلی خۆیان بۆ ئەوەی پارەکەی لەرێی وەبەرهێنان بەکار بێنێ قازانجی کرێی وەکالەت یا سەرپەرشتی لە خاوەن پارەکە وەربگرێ[٤] .

بەم جۆرە بانکی ئیسلامی بەهەمان کارەکانی بانکی سەرمایەداری هەڵئەستێ لەژێر ناوێکی شەرعی و دەستکەوتەکەشی ناوی لێ ئەنێ قازانج یاکرێ .بۆیە زۆر لەزانایانی شەریعەتی ئیسلام بە بانکی ئیسلامی و کارەکانی رازی نین و ئەڵێن هەر هەمان کارو دەستکەوتە تەنیا ناوی جودایە یا ناوێکی تری لێنراوە[٥].

لە ڕاستیدا هەوڵدانی دۆزینەوەو دروست کردنی دەزگای کۆمەلایەتی شەرعی ئیسلامی بۆ موسڵمانان و چارە دۆزینەوە بۆیان هەتا نەکەونە ناو حەرام و توشی مامەلەی حەرام نەبن کارێکی زۆر پیرۆزەو باشە بەڵکو خێریشە ئەگەر بەرێی دەرچوونی شەرعی (المخرج الشرعي) کار بکەن و تەنیا ناوگۆرین نەبێ . بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەم جۆرە کارانە بەچاو پۆشین لە حەلال و حەرام بریتینە لە پینەکردنی کەم و کورتی ڕژێمی سەرمایەداری و درێژ کردنی تەمەنی لەناو موسڵماناندا، لەکاتێکا کە پێویستە عەیب و عاری ئەم جۆرە ڕژێمە پر ستەمی ئابوری و کۆمەڵاتیە دەربخەین و ئاشکرای بکەین ، هەولی ئەوە بدەین ولاتانی ئیسلام لە جیاتی پینەکردنی کاری بێگانە ئیسلام سەر بخەن و بەکاری بێنن و بیکەنە سیستەمی هەمو لایەکانی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ لە ئەلفەوە هەتا یێ .

لە لایەکی تریشەوە لەئەنجامی تێ وورد بوونەوە لە کارەکانی بانك دەر ئەکەوێ کە کاری بانك پارە وەرگرتن و پارەدانە بەبێ ئەوەی قەبولی زیان بکا، واتە بەهیچ جۆرێك کاری بازرگانی ناکا چونکە بازرگانی وەك لەپێشا دەرکەوت شایەنی قازانج و زیانە، واتە خاوەن پارە وەك قەبولی قازانج ئەکات ئەبێ

قەبولی زیانیش بکات. کەوابوو بانك دەستگایەکی بازرگانی نیەو هیچ ئابووری ناسێك نەی وتوە بانك دەسگای بازرگانیە. بۆیە پێی ئەڵێن دەزگای وەبەرهێنان، واتە تەنیا قەبولی دەستکەوت ئەکا نەك لەدەست دان ، بەپێچەوانەی کاری بازرگانی ، کە ئەگەری زیان و قازانجی تیادایە و ڕەوایە .

کەوابو نابێ بانکی ئیسلامی ناوبنرێ بانك ، بەڵکو ئەبێ ناو بنرێ دەزگای بازرگانی و خزمەتگوزاری . چونکە بانك بەو مانایە دێ کەلەکۆنەوە لەسەری دامەزراوەو واتەی ناگۆرێ . لەوانەیە بووترێ ناو کێشە نیە ئەگەر ناوەرۆك جودا بێ ، بەڵێ وایە ، بەڵام ئەبینین کەناوێکی بوبێتە ( مصطلح ) لەسەر مانایەك هەمیشە خەڵکان بەومانای کە باوو بڵاوە تێی ئەگەن نەك بەمانای تری کە بەکارهێنەر مەبەستیەتی ، بۆ نمونە وشەی دیموکراسیەت خەڵکان بەو مانایەی وەرئەگرن کەلەجێ خۆی لێی دروست بووەو باوە کە ئەبێتە هۆی ڕێدانی زیناو ریباو حەرام خواردن حەرام کردن ، بۆیە هەرچەندی بڵێی مەبەستم لە دیموکراسیەت شتێکی ترە یا ئیسلامە کەس لێت وەرناگرێ و تێت ناگا ،چونکە ئیسلام ئیسلامەو دیمەکراسیەتیش ڕژێمێکی تایبەتی جودای ئیسلامە ، هەریەکە

ئایدیولوجیەت و فەلسەفەو بەرنامەی تایبەتی خۆی هەیە . لەبەر ئەوە خوا لەقورئانێدا قەبولی نەکرد لە جیاتی (انظرنا ) بڵێن ( راعنا ) وەك لە سورەی بەقەرەد ا فەرمویەتی:(**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انْظُرْنَا وَاسْمَعُوا** ......(١٠٤)) چونکە مەبەستی جولەکەکان لە ووشەی راعنا مەبەستێکی خراپ بوو . هەروەها پێغەمبەر ﷺ قەبولی نەکرد بە نوێژی عیشا بوترێ نوێژی تاریکان و فەرمووی : ( لا تغلبنكم الأعراب على إسم صلاتكم فإنها العشاء وإنهم ليعتمون بالإبل )[٦] واتە عەرەبە لادێیەکان بەسەرتانا زاڵ نەبن لە گۆرینی ناوی نوێژی عیشا ئەمە نوێژی عیشایە واتە تاریکان نیە، وە ئەوان واتە لادێیەکان شەو بە دۆشتنی وشتر دادێنن. چونکە خوا ناوی لێناوە عیشا نابێ بگۆرێ بۆ ناویکی واتەیەکی تری هەبێ .

بۆیە ئەبینین ولاتە ئیمپریالیزمە رۆژئاواییەکان ڕشتن لەسەر بەکار هێنانی ناوو موستەلەحەکانی خۆیان لە هەموو جیهانا چونکە موستەلەح دەربرینی ئایدیۆلیجیەتەو بڵاو بوونەوەشی سەرخستنیەتی. هەر لەبەر ئەمەش بوو فرەنسا حیجابی قەدەغە کرد چونکە حیجاب بریتیە لە دەربرینی بیرو باوەری ئیسلام و حەلاڵ و حەرام کە بێگانەکانی ئەوروپا پێ رازی نین .هەروەها زۆر لەولآتانی بێگانە نایێلن مزگەوت منارەی هەبێ چونکە منارە بویتە دروشمێکی ئیسلامی .

بۆیە موسڵمانان ئەگەر بیانەوێ ئیسلامەتی بەکار بێن و ژیانی ئیسلامی بژیێن ئەبێ هەوڵدەن دەزگاوو ناوو موستەلەحەکانی ئیسلامی و چارەسەرەکانی بەکار بێنن بۆ ئەم مەبەستە نەك شێوەی ڕژێمی سەرمایەداری یا سۆشیالیستی ، واتە ئەبێ کەسایەتی ئیسلام بپارێزن و نەیتاوێننەوە لەژێر بۆچوون و هزرەکانی ڕژێمەکانی جیای ئیسلام وەك دوژمنەکانی ئەیانەوێ و هەولی بۆ ئەدەن .

**پەراوێز:**

[1]- الإقتصاد في الفكر الإسلامي . د . أحمد شلبى8 .

[2]- مبادىء علم الإقتصاد . د . كريم مهدي الحسناوي ص239

[3]- الإقتصاد الإسلامي .د. أحمد شلبي ص 90 ، و مبادىء علم الإقتصاد .د. كريم مهدي الحسناوي .

[4]- ويكيبيديا الموسوعة الحرة | الأنترنێت

[٥]- المعاملات المالية المعاصرة في ميزان الفقه الإسلامي للكتور علي أحمد السالوس ص٧٦ فما بعدها .

[٦]- صحيح مسلم ١\٤٤٥ الحديث رقم ٦٤٤ . سنن ابن ماجة ١\٢٣٠ الحديث رقم ٧٠٤ .

# ئامانجەکانی پرۆسەی هاوسەرگیری لە ئیسلامدا

م. خیرالله مەلا حسن کاسکەیی

یەکێك لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای پەروەردگار لەم بوونەوەردا بریتیە لە ژن و ژن خوازی و شوکردن، بە درێژایی ژیان لەسەر زەوی ئەم پرۆسەی ژن خواستن و شوکردنە بەردەوام بووە و چین لەدوای چینی ئادەمیزاد پەیڕەویان لێ کردووە تا ئەم سەردەم و کاتەی ئێمە ژیانی تێدا بەسەر دەبەین، ئەوەی کە گرینگە لەم پرۆسەیە دا دیاریکردنی ئامانجە باڵاکان و هۆکارە ڕەواکانن بۆ پێکهێنانی بەردی بناغەی خێزان کە بێگومان هەنگاوی یەکەمی خێزانیش لە ژن هێنان و شوکردنەوە دەست پێ دەکات، بۆیە ئەگەر تەماشا بکەین ئیسلام جیا لە بیردۆزە دەستکردەکانی مرۆڤ کۆمەڵێك ئامانجی بەرز و پاك و خاوێنی داناوە بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری ، کە هەر یەکێکیش لەو ئامانجانە زۆر گرنگن و خاوەنی واتای بەرز و قەشەنگن و سود و قازانجی دونیایی و قیامەتیان هەیە بۆ موسڵمانان. بەمەرجێك بناغەی خێزان لەسەر چاوڕوونی ئیمانداری و خواناسی بنیات بنرێ، واتا دیاریکردنی (هاوبەشی ژیان) بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ هەر لە هەنگاوی سەرەتاییەوە بەپێی بنەما گشتیەکانی ئیسلام بن بۆ دروستکردنی خێزانێکی بەختەوەر و ئاسودە.

کە تاکە بنەمای سەرەکی ئیسلامیش بۆ پێکهێنانی خێزانێکی ئیسلام دۆست و خوا ویست و (دینە) واتا ئیمان بکرێتە پێوەری سەرەکی بۆ پێکهێنانی پرۆسەی ژن خواستن و شوکردن بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، وە لەسەر بنچینەی دینداری و ڕەوشت بەرزی (بەڵێ) بکرێ بۆ گرێبەستی هاوسەرگیری.

خوێنەرانی بەڕێز:-

بەپێویستم زانی بەکورتی بەزمانی شیرینی کوردی، هەندێك لەو ئامانجە سەرەکیانەی ئیسلام دیاری کردووە بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری باس بکەین، بە ئومێدی زیاتر و چاکتر تێگەیشتن لە بنەماو ئامانجە گشتیەکانی ئیسلام بۆ پرۆسەی هاوسەر گیری – ژن خواستن و شوکردن – کە ئامانجەکانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:-

**یەکەم: وەڵامدانەوەی سروشتی ناخی مرۆڤ:-**

گومان لەوەدانیە کە هەموو مرۆڤێکی ساغ و تەندروست باش کۆمەڵێك حەزوئارەزووی لە ناخیدا هەڵگرتووە، کە هەر یەکێك لەو ئارەزووانە بەشتێك دادەمرکێت و تێردەبێت، وەکو برسی بوون و تێنووبوون و گەڕان و سەفەرەکردن و خوێندن و خوێندنەوە و ئیشکردن و داهێنان و بەرهەمهێنان و ژن خواستن بۆ پیاو و شوکردن بۆ ئافرەت و هتد... ئەم

حەزووئارەزووانە پێیان دەگوترێ – بدیهی – واتا پێویست بەزانست و زانیاری ناکات بۆ دەستەبەرکردنیان هەر یەکێك لەم حەزووئارەزووانە کە کاتی خۆی هات مرۆڤ زۆر بەجوانی هەستیان پێدەکات. بۆ نمونە ئەگەر برسی بوو هەست دەکات کەچارەسەری برسی بوون نان خواردنە، یان ئەگەر تێنوو بوو هەست پێ دەکات کە چارەسەری تێنووبوونیش ئاوخواردنەوەیە، وەهەروەها دامرکاندنەوەی ئارەزووی جنسی لە نێوان ژن و پیاو دا بەهەمان شێوە چارەسەریەکەی بریتیە لە چوونە ناو پرۆسەی هاوسەرگیریەوە بەشێوەیەکی تەندروست و پاك. ئەم ئارەزوویوونە بۆ رەگەزی بەرامبەر پیاو بۆ ژن و ژن بۆ پیاو سروشت – فطرة–ی خودایە دروستی کردووە لە ناخ و سروشتی ژن و پیاو دا، کەواتە ولامدانەوەی مرۆڤ بۆ ئەم حەزووئارەزووە بەرێگای شەرعی و حەلاڵ ڕاستەوخۆ لەگەلْ ویست و فەرمانی خوای پەروەردگار یەك دەگرێتەوە.

ئەگەر تەماشای پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم – بکەین دەبینین کە خودی خۆی وەلامی ئەو داخوازیە سروشتیەی داوەتەوە و پرۆسەی هاوسەرگیری کردووە لەگەلْ زیاد لە خێزانێك. بەلکو زیاد لەمەش هاوسەرگیری بەبەشێك لە ڕێووشوێنی خۆی و گشت پێغەمبەران – علیهم السلام – دادەنێت و دەفەرمووێ (أربع من سنن المرسلین، الحیاء، التعطر، السواك، النکاح) رواه الترمزی. واتا چوار شت لە رەوشتی پێغەمبەرانن:–

١– شەرم و شکۆ ٢– خۆ بۆنخۆشکردن ٣– سیواك کردن ٤– هاوسەرگیری.

وەهەروەها وەکو ڕێگە چارەیەك بۆ تێرکردنی ئارەزووی جنسی بە ڕێگەی حەلاڵ ئامۆژگاری گەنجەکانی ئیسلام دۆست و موسلْمان دەکات کە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدەن و دەفەرمووێ (یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فأنه أغض للبصر وأحصن للفرج. ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فأنه له وجاء) رواه البخاری ومسلم. واتا: ئەی کۆمەلْی گەنجان هەر کەسێك لە ئێوە توانای (دارایی و جەستەیی) هەیە باژن بهێنێ، چونکە بەڕاستی هاوسەرگیری ژن خواستن بۆ کوران و شوکردن بۆ کچان چاو و داوێنتان چاکتر دەپارێزێ. کەسێکیش نەتوانێ هاوسەرگیری بکات بابەرۆژووبێت بەراستی ڕۆژوو دەبێتە مایەی دامرکاندنەوەی غەریزەی جنسی. وە لە فەرمایشتێکی تردا دەفەرمووێ (لدنیا متاع وخیر متاع الدنیا المرأة الصالحة) رواة مسلم.

**دووەم: زۆر بوونی ئوممەتی ئیسلام – جێگای شانازی پێغەمبەرمانە صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی قیامەت دا:–**

پێغەمبەر – صلی الله علیه وسلم – لە فەرمایشتێکدا دەفەرمووێ: (تزوجوا الولود الودود فأني مکاثر بکم الأمم یوم القیامة) أخرجه أبو داود،والترمزی. واتا: بخوازن ئەو ئافرەتانەی کە مندالْیان زۆر دەبێت و زۆر بەسۆزن چونکە بەڕاستی من بەزۆریتان لە قیامەتدا بەرامبەر ئوممەتانی تر خۆشحالْ دەبم. ئەوەش بەچ دەزانرێ ئافرەت مندالْی زۆر دەبێ بەوەی تەماشای بکەی خوشکی ئەو ئافرەتەی کە شوی کردووە یان پورەکانی لە دایك و باوکی کەشویان کردبێ.

**سێ یەم: دابین کردنی ئاسودەیی دەروونی بۆ ژن و پیاو:–**

یەکێك لە ئامانجەکانی ئیسلام لە هاوسەرگیری دا بۆ کوڕ و کچ ئەوەیە ڕزگاریان بکات لە دلْتەنگی و هەلْچونی دەروونی و چاولەدەری و دروستکردنی ژیانێك کە هەردوولا لەو ژیانە دا لە چلە پۆپی دلْنیایی و ئارامی نەفسی و ڕۆحی دا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرمووێ: {وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ

خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ } الروم(٢١) واتا: یەكێك لە نیشانەكانی دەسەڵات و گەورەیی خوای پەروەردگار ئەوەیە كە هەر لە ڕەگەزی مرۆڤ ژن و پیاوی دروستكردووە. واتا پیاو لە بەرامبەر ئافرەت دا ئافرەت لە بەرامبەر پیاو دا – بۆ ئەوەی ببێتە جێگای ئاسودەیی هەمیشەیی بۆیان وە خۆشەوستی و سۆزی لە نێوان ژن و پیاوەكە هاوسەری یەكترن داناوە، بەڕاستی ئەم یاسا دانانەی پەروەردگار نیشانە گەلن بۆ گەلێك بیر كاتەوە. خوای پەروەردگار ژن و مێردی بە پۆشاك بۆ یەكتر داناوە: خوای گەورە دەفەرمووێ: {هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ } البقرە(١٧٧) واتا: خێزانەكانتان بەرگ و پۆشاكن بۆ ئێوەی پیاوان، وە ئێوەی پیاوانیش بەرگ و پۆشاكن بۆ خێزانەكانتان واتا ژن و مێرد وەك و بەرگ و پۆشاك پێویستی ژیانن بۆ یەكتری. چۆن

**بێگومان خوای پەروەردگار بە لێزانی و سۆز و میهرەبانی بێسنوری خۆی هاوسەرگیری وەكو كلیلی چارەسەر داناوە بۆ پتەوكردنی قەڵای ڕەوشت بەرزی و پاراستنی لە هەر درز و كەلێنێك كە ببێتە مایەی داڕوخانی**

ناكرێ بە هیچ شێوەیەك مرۆڤ بەبێ بەرگ و پۆشاك ژیان بباتە سەر. بەهەمان شێوەش ئەوەندە گرنگ و پێویستە لە ژیان دا ژن و پیاو ببن بە هاوسەری یەكتری و پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدەن. بێگومان نە پیاو دەتوانێ بەبێ ئافرەت و وە نە ئافرەتیش دەتوانێ بەبێ پیاو بەختەوەری و ئاسودەیی ژیان بەسەر ببەن. بەڵكو هەردوكیان تەواوكەرن بۆ یەكتر و خۆشی ژیان و ئاوەدانی سەر زەوی و سەركەوتنی دونیاو دواڕۆژ بەستراوەتەوە بە پێك هێنانی بەردی بناغەی خێزان و هاوسەرگیری.

**چوارەم: پارێزگاری لە ڕەوشت بەرزی كە گەورەترین كۆڵەكەی سەركەوتنی گەلانە:-**

بێگومان خوای پەروەردگار بە لێزانی و سۆز و میهرەبانی بێسنوری خۆی هاوسەرگیری وەكو كلیلی چارەسەر داناوە بۆ پتەوكردنی قەڵای ڕەوشت بەرزی و پاراستنی لە هەر درز و كەلێنێك كە ببێتە مایەی داڕوخانی، بەڵام بە پێچەوانەوە كە ژن و پیاو بەو ئاراستە دروستەی كە خوای گەورە بۆی داناون نەڕۆیشتن ئەوا سەرەنجام توشی گرتنە بەری ئەو ڕێگایە پڕ لە هەڵدێر و كۆسپانە دەبن كە هەڕەشە لە بوون و مانەوەیان دەكات و پەلكێشیان دەكات بەرەو هەزاران نەخۆشی

